مینۆرسکی

د. مارف خەزنەدار لەرووسی‌یەوە کردوویەتی بەعەرەبی

حمە سەعید حمە کریم کردوویەتی بە کوردی

١٩٨٣

تێبینـــــی : ـ

(١) ئەو وێنانەی لەم کتێبەدان بەمەبەستی روون کردنەوەی هەندێ لایەنی ژیانی کوردو جیاوازی ســـەردەمی نووسەرو ئەم سەردەمەی ئێستامان خۆم دام ناوون.

(٢) ئەو پەراوێزانەی ژمارەیانْ بـــۆ دانـراوە پەراوێزی نووسەرو د. مارف ـ ن ـ ئەوانەشـــی ـ مارف ـ یان بـــۆ دانراوە هەر هینی د. مارف خـەزنەدارن و ، ئەوانەشـــی نیشانەی ئەســـتێرەیان بۆ دانراوە هینی خـــۆمن.

حمـــه ســـعید

■ دانەر بەم شێوەیە کتێبەکەی پێشکەش دەکا :-

* یەکەم بەرهەمی گەشتەکەمان لە ســاڵی ١٩١٤ دا پێشکەش بێت بە خێزانم و هاوڕێی کاروانم.

* منیش ئەم هەوڵەم پێشکەش ئەکەم بە هەموو ئــەو گیانــە زینــدوو نەمرانەی کە بایەخیان بەکوردو کوردستان داوە.

حمــە ســعید

## پێشـــــەکی

نزیکەی ســـەدەیەك لەمەوبەر حاجی قادری مـــەزن فەرموویەتی : ـ

**مەعلومە بۆچی (حاجی) مەدحت دەکا بەکوردی**
**تاکەس نەڵێ بەکوردی نەکراوە مەدحی بـــاری**

هەموو شتێ کە دەبێتە هۆی بەرز کردنەوەی زمانی کوردی ، پێویستە بە زمانی کوردی بنووسرێ یا بکرێتە کوردی . هەمـــوو ئەدەبێکی بەرزو بیروڕایەکی بەجێ و تاقی کردنەوەیەکی پڕسود پێویستە پێشکەش بـە هەموو کەسێك بکرێ ؛ دیارە هێنانەدی ئـەم ئامانجە تەنیا بـــە گوڕینی ئـــەو بەرهەمانە دەبێ لـــە زمانە ئەسڵیەکەی خۆیانەوە بۆ زمانانی تر .

لەبەر ئەوەیە کۆمەڵی پێشـــکەوتوو بایەخێکی تـەواو بەوەرگێران دەدا ، ئێمەی کورد ڕەنگە لە پێش قۆناغی گاگۆڵکێش دابین لەم ڕووەوە . لەبەر ئەوەیە بارمان لـــە باری نەوەکو نەتەوە پێش کەوتووەکانیش قورسترە ، بەڵکو

لــه ریزی پشت نەتەوە تازە هۆشیار بووەکانیشەوەین ، بۆیە پێویستی سەرشانی ئێمە تەنیا وەرگێرانی ئەو ئەدەبە بەرزەو بیروڕا بەجێیەو تاقی کردنەوە پڕ سوودە نی‌یە، بەڵکو وەرگێڕانی هەموو ئەو قسانەیە کە لەسەر کورد کراوەو بە زمانی بێگانان بەتایبەتی نەتەوە پێشکەوتووە۔ کانی ئەوروپا چاپکراوون.

ئێمە ئەوە باش دەزانین ئەوەی وتراوە هەمووی بـە دڵی ئێمە نی‌یە ، قسەی باش لەسەر کورد زۆرە ، بەلام قسەی خراپیش کەم‌نی‌یە ، ئێمە نالێین دەبێ قسە باشەکان وەرگێڕینـە ســەر زمانی کوردی و ئــەوانی دیکەش بشارینەوە ، بەلام ڕەنگە بــۆ باری ئێستای نەتەوەکەمان باشتر ئەوەبێ ئەو سەرچاوەو کەرەستانە بگۆڕینە ســەر زمانی کوردی ، کە لایەنی باش‌و ڕاستیان زاڵە بەسـەر لایەنی خراپەو ناڕاستیان دا ، ئەویش تەنیا لەبەر زرووفی تایبەتی نەتەوەکەمان .

بیروڕای ئێمە لەبابەت وەرگێڕان لەمەیدانی کولتووری نەتەوایەتی کوردەوە هەمیشە ئەوە بووە :ـ لەلایەك پێویستە ئاگاداری ئەو نووسین و ڕایانە بین کە بێگانە دەریان دەبڕێ ، هەروەها بەپێی توانا پێویستە خەڵکی تر بــە کورد بناسێنین ، واتە لەسەر کورد بنووسین بەزمانانی تر ، یا گۆڕینی بەرهەمی کوردی بۆ ئەو زمانانە .

بێ‌گومان بەرهەمی ئەوروپایی لــەســەر کورد دەبێ

وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی ، بەڵام ئەگەر هەر لەو کاتەدا تووانیمان ئـەو بەرهەمە بگۆڕینە سـەر زمانی عەرەبی دیارە وەکو قسەی نەستەقی کورد دەڵێ : ـ بە بەردێك دوو چۆلەکە دەکوژین ـ هەر لەبەر ئەوەش بوو لەکاتی خۆیدا ئەم بەرهەمەی مینۆرسکی‌مان هەڵبژاردوو لە ساڵی ۱۹٦۸ دا وەرمان گێڕایە سەر زمانی عەرەبی ، بەڵام هەر لەوکاتەشدا گومانمان لەوە نەبوو کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەبێ بکرێ بە کوردیش .

ڤلادیمێر مینۆرسکی ئەگەر گەورەترینی کوردە ناسی ئەورووپا نەبێ لە ڕۆژی پەیدا بوونی ڕۆژهەڵات ناسی‌یەوە تا سەردەمی ئێستامان ، بێ‌گومان سـەرۆکی بزووتنەوەی کورد ناسی‌ی ئەورووپایە لەسەدەی بیستەمـدا ، نەوەکو تەنیا بەوەی لە هەموو مەیدانی کورد ناسی‌دا بەرهەمی هەیەو بەقەوارە زۆریشە ، بەڵکو کورد ناسی خستە ناو قاڵبێکی زانستی‌و لە هەموو سۆزێکی شەخسی دووری خستەوە ، بەڵام نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە کوردی وەکو نەتەوەیەك خۆش ویستووە .

مەبەسـتی مینۆرسـکی تەنیا بیروڕاو لێکۆڵینەوەو پشکنینەوە نەبوو لە کولتوری نەتەوایەتی کورد ، بەڵکو کۆکردنەوەی سامانی نەتەوایەتی‌ی میللەتیش بوو ، بـە تایبەتی دەست خستنی دەسنووسی کوردی . لە گەشتە ـ کانی‌دا بۆ کودستان کۆمەڵێك دەسنووسی پەیـدا کرد ، ئەمانە ئەوەندە بـە نرخ بوون گەلێ لایـەنی ڕووناك و پێشکەوتووی دنیای ئەدەبی کوردی‌یان خستە ڕوو ، هەر

ئەو دەسنووسانەش بوون بـــە کەرەستەو سەرچاوەیێکی بنچینەیی بۆ گەلێ لـە نووسینو تێبینی‌یەکانی لە بارەی ئەدەبو مێژووی سیاسی نەتەوەی کوردەوە .

جێی خۆیەتی ئەم شاکارەی مینۆرسکی لە ڕۆژگاری ئـەمڕۆدا بـــڵاوبکرێتەوە پاش ئــەوەی عەرەبی‌یەکەی هەمووی بـــڵاوبووەوەو دەسکەوتنی تەنیـا دانەیێکیشی کارێکی قورسە .

جا وا بـــۆ ئەم ئامانجە برای خۆشـــەویستمان حەمە سەعیدی حەمە کەریمی فەرەج چالاکانە هاتە پێشەوە ، تاقی کردنەوەی پێشوی لـەم بارەیەوە هەیە ، بـــەوەی بیروڕای هەندێ لە ڕۆژهەڵات ناسو کورد ناسەکانی تری لە ڕێگەی زمانی عەرەبی‌یەوە کردووە بە کوردی .

ئەم کارە کردەوەیەکی بەجێیە بۆ خوێنەری کورد ، دەتوانێ لە نزیکەوە هەندێ لە بەرهەمی مینۆرسکی بە کوردی بخوێنێتەوە ، هەروەها دەبێ بە هۆی دەوڵەمەندی نامەخانەی کوردی و ، وەفاو ڕێز گرتنێکیشـــە لە گیانی مینۆرسکی ، ئەوەی تامردن سۆزو خۆشەویستی‌ی بەرامبەر بـــە کورد جێگەیێکی دیاری هەبـــوو لـــە ناخی دڵ و دەروونی دا .

پیرۆزبایی لە حەمە سەعید دەکەم .

**مارف خەزنەدار**

بەغداد : ٣ی تەمووزی ١٩٨١

## پێشەکی چاپی عەرەبی

مامۆستای زانستگای لەندەن ، ئەنـدامی ئەکادیمیەی زانســتی بـەریتانیا ، ئەنــدامی ئەکادیمیەی زانســتی فەرەنسی ، ئەندامی شانازی کۆمەڵەی ئاسیای فەرەنسی ، ئەندامی شانازی کۆمەڵەی ئاسیای ئەڵمانی ، هـەڵگری میدالیای زێڕی کۆمەڵەی ئاســیای بەریتانی ، دکتۆری شانازی زانـستگای کامبرج ، دکتۆری شانازی زانستگا سەربەستەکانی بەلجیکا ، ڤلادیمێر ڤیۆدۆرۆڤیچ مینۆرسکی لە ـ ٥ ـ ی شوباتی ـ ساڵی ۱۸۷۷دا لە دێی (کۆرجیڤا)ی بەشی سەرووی ـ رۆژئاوای مۆسکۆدا هاتۆتە دنیاوە ، خوێندنی سەرەتایی لە مۆسکۆدا تەواو کردووە ، دووای ئـەوە چووەتە کولیجی یاســای زانستگای مۆســکۆ و ئامۆژگای لازاریڤـی زمانەکانی رۆژهەڵات و بووەتـە خاوەنی بڕوانامەی هەردوو کیان .

وا دیارە نووسەر هەر دووای تەواو کردنی خوێندنی بەرزی ئیتر یەکسەر چوەتە بەشی دیبلۆماسی وەزارەتی دەرەوەی ئیمپراتۆری‌یەتی رووسیا .

له ساله‌کانی ۱۹۰٤ ـ ۱۹۰۸ دا بووه‌ته پرس پێکه‌ری بالوێزخانه‌و قونسوڵخانه‌ی ڕووسیا له تاران و ته‌وریزدا . چه‌ند گه‌شتێکی سه‌یر کردنو وورد بونه‌وه‌ی کردۆتـه به‌شی سه‌روو ـ سه‌رووی رۆژئاوای ئێران ـ کوردستان ـ .

له ساڵی ۱۹۱۳ دا کراوه به ئه‌ندامی لیژنه‌ی دیاری کردنی سنوور له نێوان ده‌وڵه‌تی عوسمانیو ئێرانیداه ، دووای ئه‌وه کراوه به پرس پێکه‌ری تایبه‌تی بالوێزخانه‌ی رووسی له تاران ، تا ساڵی ۱۹۱۹ له‌و کاره‌دا ماوه‌ته‌وه(۱)، تا گوێزراوه‌ته‌وه بۆ پاریسو له‌وێش ماوه‌یه‌کی کورت له بالۆێزخانه‌ی رووسیادا ئیشی کردووه .

مینۆرسکی ژیانی ســیاسی واز لێهێناو(۲) ـ واش ئه‌زانم بــۆ ئه‌وه دروست نه‌کراوه ـ لای کرد به لای

---

(۱) لێره‌دا پێویسته باسی ئه‌وه بکه‌ین که دووای هه‌ڵگیر ـ سانی شۆڕشی ئۆکتۆبه‌ر له ساڵی ۱۹۱۷ دا ، زۆر له کاربه‌ده‌ستانی بالوێزخانه‌کانی رووســیا پشــتگیری شۆڕشیان نه‌کردوو لــه دژی وه‌ستانو ئه‌م حاڵه‌ش ماوه‌یه‌کی زۆری خایاند .

(۲) مه‌به‌ستمان لــه ژیانی سـیاسی ، چالاکی ســیاسی رۆژانه‌یه ، ئه‌گینا سیاسه‌تی رووت وه‌کو رێ ره‌وو بیروڕا ، هه‌ر له‌گه‌ڵ مرۆڤ دایه ، ماده‌مێکم بیری هه‌یه .

ئیشی رۆژهەڵات ناسی یەکەیەوە ؛ لـە پاریس دا کراوە بە مامۆستاو زۆری نەخایاندوە لە ساڵی ۱۹۳۲ دا وازی لێهێناوەو چوە بۆ لەندەن و لە قوتابخانەی رۆژهەڵاتیدا ئیشوکاری وانەوتنەوەی دراوەتێ ، وەکاتێك لە ســاڵی ۱۹۳۹دا قوتابخانەکە ئەگوێزرێتەوە بۆ کامبرج ، ئەویش ئەچێتە ئەوێ و ئیتر ئەبێتە نیشتە جێ ی هەمیشەیی .

دووای مردنی پرۆڤیسۆر ـ د . رۆسای ـ ســەرۆکی بەشی ئێرانی لە ساڵی ۱۹۳۷ دا مینۆرسکی هەڵبژێررا بە سەرۆکی ئــەو بەشەو تیا مایەوە هەتا لە ساڵی ۱۹٤۱ دا کار کەنار کرا بەڵام هەر بە ئەندامێتی شانازی زانستگاکە مایــەوە .

نووسەر هاوبەشی ژمارەیەك لـە کۆنگرە رۆژهـەڵات ناسیە جیهانی یەکانی کردووە ، لە ساڵی ۱۹٤۰ داو لــە کۆنگرەی بیستەمی رۆژهەڵات ناسی دا کە لە بروکسل گیرا راپۆرتێکی دەربارەی ( نەژادی کورد ) خوێندۆتەوە .

مینۆرسکی لە ۲٥ ی مارتی ۱۹٦٦ دا لە لەندەن کۆچی دوایی کردوو رۆژنامەو گۆڤارە جیهانی و سۆڤیەتیە بــە ناوبانگەکان وتاری ماتەمینیان بۆ نووسی .

* * *

ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی جێگای رۆژهەڵات ناسی ئەوروپا هەبێت ، ئەوا جێگای لێکۆڵینەوەی کورد ناسی رووسیا بووەو تاکو ئێستاش هەر ئەویێە ، گەلێك لەو رۆژهەڵات ناسانەی کە لە بەشی لێکۆڵینەوەی کوردیداو لە ئەوروپا کاریان کردوە ، خەڵکی وڵاتی رووسن و دەرچووی ئامۆژگاکانی ئەوێن ، وەکو ، خۆدزکۆ ، نیکتین ، مینۆرسکی و هینی تریش ، هەروەها لە دوایشدا گەلێ باس و لێکۆڵینەوەی کوردی پسپۆرە ئەورپاییەکان بەدەر لە رووسەکان خۆیان لە رووسیاو یەکیەتی سۆڤیەتدا بڵاوکرانەوە .

مینۆرسکی یەکێکە لەو زانایانەی کە نیوەی ژیانی خۆیان لە وڵاتی خۆیانداو نیوەکەی تری لە وڵاتی غەریبیدا بەسەر بردووە ، بەڵام لە هەر شوێنێك نووسینیو بەرهەمی بە هەر زمانێك نووسرابێتەوە هەر پارێزگاری خوورەوشتو کەلەپوری رۆژهەڵات ناسی رووسی خۆی کردووە .

ئەتوانرێ ژیانی سیاسی و زانیاری و بیری مینۆرسکی بکرێت بەسێ قۆناغەوە .

قۆناغی یەکەم ، ( یان قۆناغی رووسی ) ، ئەم قۆناغە لەسەرەتای سەدەی بیستەمو لە تەواو کردنی ئامۆژگای

لازاریڤ ی ڕۆژهەڵات ناسیو کولیجی یاسا لە زانستگای مۆسکۆدا دەست پێ ئەکات ، هەتا شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ .

لەم ماوەیەدا فەرمانبەر بووە لە وەزارەتی دەرەوەی ئیمپراتۆری یەتی رووسیدا لەکاتی کاری دیبلۆماسیدا لە گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەکۆڵیەوە و زانیاری دەربارەیان کۆئەکردەوە و بیروڕاو تاقی کردنەوەکانی خۆی بۆ نەوەکانی داهاتوو ئەنووسی. لەوانەیە وابێت بە خەیالدا کە ئەم لێکۆڵینەوانە بە مەبەستی سیاسی کرا-بێ و پەیوەندی بە تەماعی دەوڵەتەوە هەبوو بێت ، بەڵام هەر چۆن بێت وەکو کەلەپوور و گەنجینەیەك مایەوە بۆ لێکۆڵینەوەکانی داهاتوو کەڵکی زۆری لێوەرگیرا ، نووسەر لێکۆڵینەوەو تێبینی و تێڕوانینەکانی خۆی بە زمانی رووسی ئەنووسی یەوە ، لە ئیشە گرنگەکانی ئەم ماوەیەی کتێبی ( ئەهلی حەق ) بوو کە لە ساڵی ١٩١١ دا لە مۆسکۆ چاپکراوە ، هەروەها ئەم کتێبەی وا ئێستا بە زمانی عەرەبی ئەیخەینە بەردەستی خوێنەر .

مینۆرسکی لەسەر تای تەرازووی ئەو ڕۆشنبیرە بۆر-ژوایانە دائەنرا کە هیچ هەڵوێستێکی ئاشکرایان دەربارەی بزووتنەوەی کرێکارانی رووسیای قەیسەریدا نەبووە ، یان بەواتایەکی تر ئەتوانین بڵێین لە زۆرکاتدا هەڵوێستیان دوژمنانە بووە ، بەڵام ئەوەی پێویستە تێبینی بکرێت

ئەوەیە کە ئیشە رۆژهەڵات ناسی‌یەکانی مینۆرسکی بـە شـیکردنەوەی وردی تازەو هەڵقوڵاو لە بیرێکی تیژوو گیانێکی زانیاری‌یانەی بەرزەوە لە بزوتنەوەی رۆژهەڵات ناسی رووسیدا خزمەتێکی زۆر چاکی پێشکەش کردووە (لەم مەسەلەیە پەیوەندی بە رۆژهەڵات ناسەکانی تریشەوە هەیە) مینۆرسکی راستەوخۆ لە گەلانی ئێران و تورك و کوردو عەرەبی کۆڵیوەتەوە، لە لادێ و گەلێ شـوێنی دووا کەوتوودا و هەندێ جار شوێنی سەختا، لە شوێنی گەڕۆکدا پەیوەندی کردووە بەخەڵکی ئـەو وڵاتانـەوە، دەربارەی خووڕەوشتی دانیشتووانیانی نووسیوەو فێری زمانیان بووە، ئەم ئیشانەی بوونەتە لاپەڕەیەکی جوان لە کەلەپووری رۆژهەڵاتناسی کلاسیکی لە ئەورووپادا.

بەڵام قۆناغی دووەمیان، یان (قۆناغی بێ ئۆقرەیی) لە ژیانی مینۆرسکی دا ئەو ماوەیەیە لـە نێوان شۆڕشی سۆشیالیستی و دووەم جەنگی جیهانیدا، لـە سـەرەتای شۆڕشدا دوورە پەرێز بوو لە شۆڕش، یان بەشێوەیەکی تر لە سالەکانی ۱۹۱۷ و ۱۹۱۹ دا چووە ریزی دوژمنانی شۆڕشەوە، لە تاراندا لە دژی شۆڕش و فەرمان ڕەوایەتی سۆڤیەت ئەجوڵایەوە، بـەڵام زۆری پێ نەچوو ئێرانی بەجێ هێشت و رووی کردە پاریس، لەوێ پەیوەنـدی کردووە بـە باڵوێزخانەی رووسـیاوە کە کۆمەڵێك لـە دژەکانی شۆڕشی تیا کۆ بوو بووەوە، بەڵام بەردەوام و ماوەی زۆر ئیشی لەگەڵدا نەکردن، تا بە شـێوەیەکی

کۆتایی وازی لە ئیشوکاری سیاسی هێناوەو لای کردووە بەلای زانیاری‌یەوە ، لە قوتابخانەی زمانەکانی ڕۆژهەلاتی زیندوودا لە پاریس وانەی ئەدەبی ئیسلامی وتۆتەوە ، هەروەها وانەی لە مێژووی ئیسلام‌و تورکیادا لە ئامۆژگاو کولیجە جۆربەجۆرەکانی فەرەنسادا وتۆتەوە .

مینۆرسکی لە سالی ۱۹۳۲ دا چووەتە لەندەن و لە قوتابخانەی ڕۆژهەلاتناسی‌و زانستگای لەندەن‌دا ئەدەب‌و مێژووی ولاتانی وتۆتەوە ، هەتا لە سالی ۱۹٤٤دا کارکەنار کراوە . نووسەر لەم قۆناغەدا لێکۆلینەوەکانی بە زمانی ئینگلیزی‌و فەرەنسی‌و ئەلمانی بلاوکردۆتەوە ، بەشێوەیەکی تایبەتی ئەو وتارانەی بەو سێ زمانەی سەرەوە دەرئەچوون ، دەربارەی گەلانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ڕۆشنبیری‌یان بۆ ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلامی نووسیوون ، ئەوەشی پەیوەندی بە گەلی کوردەوە هەبێت ( کورد و کوردستان ) و ( لەك و لوڕ ) ی نووسیووە .

قۆناغی کۆتایی‌یان ، ( قۆناغی ئۆقرەگرتن ) ، ئەمیش لە دەست پێ‌کردنی هێرشی ئەلمانی لە دژی یەکیەتی سۆڤیەتەوە دەست پێ‌ئەکات ، ناوەندە ڕۆژهەلاتناسی‌یە سۆڤیەتیەکان وا ئەزانن دەست بۆ بردن‌و باس کردنی گۆڕان لە بیرو سیاسەتی مینۆرسکی‌دا شتێکی گرانەو پێویستی بە لێکۆلینەوەی وردوو قول هەیە ، بەلام ئەمە هەر چۆن بێت مینۆرسکی هەر لەسالی ۱۹٤۱ەوە و لە

کاتی دەست پێ کردنی هێرشـــی دڕنـدانەی ئەلمانیای فاشی یەوە بۆ سـەر نیشتمانەکەی . ئیتر هەستی بەرانبەر نیشتمان‌و رژێمە تازەکەی جولاوەو لە ســالی ۱۹٤۲ دا کاتێك کە کتێبی ( شرف الزمان ) ی طاهــر مروازی بلاوکرایەوە ، ئەم پێشکەشی کرد بە زانستگای مۆسکۆ کە بڕوانامەی یاساناسی داوەتێ ، هەروەها لە ســالی ۱۹٤۳دا‌و کاتێك کە کتێبی ( تذکرة العلوم ) بلاوکرایەوە ، ئەم پێشکەشی کردووە بە ( رۆژهەلاتناسە سۆڤیەتیەکانی رۆژانی لێقەومانی گەورەیان ) ، دووای ئەوە دەســتی کردووە بە نزیك بوونەوە لە رۆژهەلاتناسە سۆڤیەتیەکان‌و نامــەی لەگەلدا گۆڕیونەتەوە‌و راپۆرتی زانستی یانەی دەربارەی بەرهەمەکانیان لە بوواری لێکۆلینەوەی رۆژ-هەلاتناسی دا کە لە یەکیەتی سۆڤیەت بلاویان ئەکردنەوە نووسیوە‌و بلاوی کردوونەتەوە .

مینۆرسکی دووای شۆڕش بۆ یەکەمجار لـە ســالی ۱۹٦۰ دا سەری لە نیشتمانەکەی داوە‌و لە کاتێکدا کە هاوبەشی کۆنگرەی بیست‌و پێنج هەمینی رۆژهەلاتناسانی جیهانی کردووە کە لە مۆسکۆدا گیراوە ، لەم گەشتەیدا سەری لە لینینگراد‌و باکــۆ و تەفلیس داوە‌و ، جێگای رێز‌و خۆشحالی‌و خەلاتکردنی دەستەودایەرەو رێکخراوە زانستی‌و رۆشنبیری‌یەکان بووە ، رازی بوونی خۆی لە کورد‌و ولاتەکەیان دەربڕیوە‌و لە کۆبوونەوەیەکی تایبە-تیــدا لەگەل کوردە هاوبەشەکانی ئــەو کۆنگرەیــەدا

وتوویەتی : ( لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا بـوو ، ولاتـە جوانە رازاوەکەتانم دی ، بێگومان ئێستا پێشکەوتووە ، بەڵام من وا ئەزانم کە پێشکەوتنێکی لەســەر خۆیـە ، دانیشتووانیم خۆش ئەویست و ئێستاش خۆشم ئەوێـن ، من زۆر بەختیارم لەم کۆرە جیهانی‌یـەدا کورد ئەبینم و هاتوون بە دووای رۆشنبیری خۆیاندا ئەگەڕێن ) کارەکانی مینۆرسکی لە رۆژهەڵات ناسی ئەورووپادا بـە سامانێکی گەورە دائەنرێ و بەهای بۆ دائەنرێ ، بێگومان بۆ ئەوەش کە کەلکی لێ وەربگیرێ پێویستی بە وەرگێڕان هەیە ، تا وەکو لــە بەردەســتی خوێنەری رۆژهەڵاتیدا بێت ، بێگومان لـە دووایدا گەلێ مەسەلەی مێژوویی و ئەدەبی گرێ گرێ‌یاوی و تەواو نەکراوی رۆشنبیری ئەم گەلانە شی ئەکاتەوە .

هەر چەندە ئەم کتێبەی ئەیخەمە بەردەستی خوێنەری عەرەب ، پێش زیاتر لە نیوسەدە نووسراوە بەڵام هێشتا چــاکی و کاری خۆی ون نەکردووە ، من وا ئــەزانم ماوەیەکی دووروو درێژی تریش ، وەکو سەرچاوەیەکی گرنگ لە بواری لێکۆڵینەوەی کوردا هەر ئەمێنێتەوە ، دووای ئەوە کتێبەکەش تەنها تێبینی و ورد بوونەوە نی‌یە ، بەڵکو کتێبێکی لێکۆڵینەوەیی قوڵ و پشکنینی زانستیانەی تیایەو بە بەرزترینی ئــەو لێکۆڵینەوە ئەورووپاییانە دائەنرێ کە دەربارەی کورد نووسراون .

نووسەر لە سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سـەدەی بیستەمدا کارێکی گەورەی کردۆتە سەر ڕاست کردنەوەی ڕای هەندێ لەو ڕۆژهەڵات ناسانەی کە لەسەر کوردی ـ یان نووسیووە ، بەڵام لـە سروشتی مرۆڤ و نیشتمان و زمانی کورد نەگەیشتوون هەر لەو کاتەشدا حوکمەکانیان سەرپێی و تووندو تیژ بوون ، بـەڵام دەربارەی ڕای نووسەر خۆی،سەرەڕای ئەوەی کە هەندێکیان لێکۆڵینەوەو موناقەشە هەڵئەگرن هێشتا هەر مرۆڤ واڵێ ئەکەن کە بە چاوی ڕازی بوون و ڕێزەوە سەیریان بکات .

بەڵام هەر چۆن بێت ئەو بیروڕایانە لە زادەی بیری زانایەکی گەورەو بەرزترینی ئەو موفەکیرانەوە کە ژیانی خۆیان بۆلێکۆڵینەوەو باس کردنی گەلانی ڕۆژهـەڵات تەرخان کردووە دەرچوون ، بەڵام نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ کە مینۆرسکی مرۆڤێکی چاك بووە و لـە قوڵایی دڵیەوە ئەو گەلانەی خۆش ویستووە کە باسی کردوونو بە چاوێکی ڕازی بوونو گەورەییەوە سەیری ڕۆشنبیری ـ یانی کردووە .

نووسەر زۆرجار باسی هەندێ لایەنی خراپەی ڕەوشتی کورد ئەکاتو پشت بە نموونەی ڕووداوی تاك ئەبەستێ کە ناتوانرێ بە بنەڕەت یاخود سیفەتی هەموو ڕۆڵەکانی گەل دابنرێت و بە شێوەیەکی گشتی چاکەو خراپە لـە

رووداوه تاکه‌کاندا کارێکن له‌لایه‌ن خه‌لکانێکی تاکه‌وه ئه‌کرێن ، چاکه‌ش سیفه‌تی هه‌موو گه‌له ، ئیتر ئه‌و گه‌له هه‌رچی گه‌لێك بێت .

داواکارم وه‌رگێڕانی ئه‌م کتێبه ببێته هانده‌رێك بـۆ راست کردنه‌وه‌و پیاچوونه‌وه‌ی رای ئـه‌و که‌ســانه‌ی بایه‌خیان به مه‌سه‌له‌ی کورد داوه ، به تایبه‌تی ئه‌وانـه‌ی دوور له واقیع و راستی‌یه‌وه سه‌یری مه‌سه‌له‌که ئه‌که‌ن و به‌که‌ڵك بێ بۆ ئه‌وانه‌ی به شێوه‌یه‌کی گشتی بایـه‌خیان به‌رۆشنبیری گه‌لانی رۆژهه‌ڵاتی ناوه‌راست داوه .

له کۆتایی ئه‌م پێشه‌کی‌یه کورته‌شدا حـــه‌ز ئـه‌که‌م ده‌ست بۆ ئه‌وه رابکێشم که مینۆرســکی پێش مردنی وه‌سیه‌تی کردووه که هه‌موو سامانه رۆشنبیری‌یه‌که‌ی له کتێب و ده‌ستنووس و باســـی بلاَونه‌کراوه ، پێش که‌ش بکرێت به نامه‌خانه‌ی ئامۆژگای گه‌لانی ئاسیای سه‌ر به ئاکادیمیه‌ی زانســـتی سۆڤیه‌تی له لینینگراد . جا هـــه‌ر وه‌کو له‌وه‌ســـیه‌ته‌که‌یدا وتبووی ، دووای مردنـــه‌که‌ی ئیتر نامه‌خانه ده‌وڵه‌مه‌نده‌که‌ی گوێزرایه‌وه بۆ لینینگراد و لیژنه‌یه‌کی تایبه‌تی بۆ رێکخستن‌و ریـــز کردنی کتێبه‌کانی پێك هێنراو ناونرا ( نامه‌خانه‌ی مینۆرسکی ) .

وه له هاوینی ساڵی ۱۹٦۷ دا خاتو میلۆرسکایای ژنی

سەردانێکی تایبەتی کردە لینینگراد ، بۆ ئەوەی سەیری
چۆنیەتی جێ بەجێ کردنی وەسیەتی مێردەکەی بکات .

**مارف خــەزنەدار**

لینینگـــراد -- بغـــداد
١١ / کانونی یەکەم -- ٢١ / مایسی / ١٩٦٨

## نیشتمانی کورد ، جووگرافیای ولاتەکەیان(۱)

بۆ ئەوەی جوگرافیای ئەو بەشەی ئاسیای لەمەودووا باسی ئەکەین ، بە تەواوی دیاری بکەین ، پێویستە باسی دووشـتی لەگەڵ یەك گونجاودا بکەین ، کە ئەوانیش چیاکانی ئاراراتو کەنداوی ئەسکەندەروونەیە ، لـە بەشی خواروی ئاراراتدا و لە دووری ماوەی زیاتر لە هەزار فرسەق ، زنجیرە چیایەك درێژ بۆتەوە و بەشێوەیەکی رێك لە سەرەوە بۆ خوارەوە چوونەتە ناویەکەوە ، دووای ئـەوە گەلێ زنجیرەی تر پێك ئەهێنێ و بـەرەو خوارووی رۆژهەلات بۆ کەنداوی عەرەبی شۆڕئەبێتەوە .

بەشی یەکەمی ئەم زنجیرەیە پێ‌ی ئەوترێ (زنجیرەی سنووری تورکی و - فارسی) . ئەم بەشە ناوچەکە بەش ئەکات بـە دوو کۆمەڵی شاخاوی و هەردوو دەریاچەی وانو ئۆرمی‌یەوە ، بەشی دووەمیش درێژ ئەبێتەوە تا ئەگاتە سنووری تورکیاو ولاتی فارس،ئەم چیا بەرزانەو ئەو قەدپالانەی

---

(۱) نووسـەر کورتەی ئەم وتارەی لـە ۱۵ ی مایسی ۱۹۱۵ داو لە کۆبونەوەیەکی کۆمەلەی رۆژهەلاتناسانی رووسدا خوێندۆتەوە .

## نیشتمانی کورد ، جووگرافیای ولاتەکەیان(١)

بۆ ئەوەی جوگرافیای ئەو بەشەی ئاسیای لەمەودووا باسی ئەکەین ، بە تەواوی دیاری بکەین ، پێویستە باسی دووشـتی لەگەڵ یەك گونجاودا بکەین ، کە ئەوانیش چیاکانی ئارارات‌و کەنداوی ئەسکەندەروونەیە ، لـە بەشی خواروی ئارارات‌داو لە دووری ماوەی زیاتر لە هەزار فرسەق ، زنجیرە چیایەك درێژ بۆتەوەو بەشێوە‌یەکی رێك لە سەرەوە بۆ خوارەوە چوونەتە ناویەکەوە ، دووای ئـەوە گەلێ زنجیرەی تر پێك ئەهێنێ و بـەرەو خواررووی رۆژهەلات بۆ کەنداوی عەرەبی شۆڕئەبێتەوە .

بەشی یەکەمی ئەم زنجیرەیە پێی ئەوترێ (زنجیرەی سنووری تورکی و - فارسی) . ئەم بەشە ناوچەکە بەش ئەکات بـە دوو کۆمەڵی شاخاوی و هەردوو دەریاچەی وان‌و ئۆرمی‌یەوە ، بەشی دووەمیش درێژ ئەبێتەوە تا ئەگاتە سنووری تورکیاو ولاتی فارس،ئەم چیا بەرزانەو ئەو قەدپالانەی

(١) نووسـەر کورتەی ئەم وتارەی لـە ١٥ ی مایسی ١٩١٥ داو لە کۆبونەوەیەکی کۆمەڵەی رۆژهەلات ناسانی رووسدا خوێندۆتەوە .

ئەکەونە نێوان زنجیرە چیاکانی ئێران و ولاتی نێوان دوو رووبارەوە (میزوپۆتامیا - بلاد مابین النهرین) بە مانا کۆنەکەی پێی ئەڵێن زاگرۆس (وابزانم ئەم وشەیە لە بنەڕەتا گریکی‌یەو گەلانی رۆژهەلات نایزانن) چیاکانی ئاگری داغ لە ئاراراتەوە بەرەو خوارروو درێژ ئەبنەوە لە دووای قەفتاسی ئێمەوە لە زنجیرە چیاکانی ئەرمەنی جیا ئەبێتەوە و لە دووایيدا جارێکی تر ئەچێتەوە بەناویدا. ئەگەر بەرەو ئەسـکەندەرونەش رۆیشتین، دووای ماوەیەکی کورت لە سەرروویدا زنجیرەچیاکانی تۆرۆس، کە سەرچاوەو جۆگاکانی رووباری دەریای سور و ولاتی نێوان دوو رووبار دابەش ئەکەن، بەدی ئەکەین. بەلام رووی گشتی ئەنتی تۆرۆس بەرەو ژووررووی - رۆژهەلات بەسێلادا ئەرووات :- ژووررووە، ناوەڕاست، تۆرۆسی ئەرمینیای خوارروو، تا بەرووی قارس وماکۆ و ئاراراتدا ئەروات(۲).

سەرچاوە سەرەکی‌یەکانی فورات ئەکەونە ئەو

---

(۲) زنجیرەی ژووررووە بەرەو ساگانلۆگ ئەروات، دووای ئەوشەڕانەی لەم دوواییەدا ڕوویان‌دا ناوبانگی پەیدا کرد، بەلام خواروەکەی لەگەڵ ئاگری داغ دا یەك ئەگرێ، بەلام ناوەڕاستی ئالاداغ درێژ ئەبێتەوە تا ئەگاتە بوومە لەرزەی هێمنی تاندۆك کە ئەکەوێتە سەرسنووری فارسی لە نزیکی ماکۆ لە دەورووپشتی ئاواجیك دا.

دۆڵانەوە کە بەستراوون بە زنجیرە کانی ئەنتی تۆرۆسەوەو لە دوو رووبار پێك دێن :ـ

یەکەم :ـ مرادسۆ :ـ کە لەنزیکی ئاراراتەوە لە دۆلی ئەلاشکەرت‌دا دەست پێ ئەکات .

دووەم :ـ قەرەسۆ :ـ یان فورات سۆ(٣) کە ئەمیش لە ئەرز روومەوە هەڵ ئەقولێت .

سەرچاوە کانی رووباری ئاراس ئەکەونە نێوان ئەم دوو رووبارەوە ، لەسەر زنجیرە چیاکانی چیای ( بن گوڵ ) ، بەشێوەیەکی پێچەوانە بەرەو ژووروو ئەڕوات ، بـــەڵام مرادچای و فورات یەکەمجار بەرەو خواروو ی رۆژئاوا ئەرۆن ، دووای ئەوە مرادچای لە شوێنێکدا لەسەرچاوە‌ـ کانی دیجلە نزیك ئەبێتەوە و ناتوانێ دیوارەتەنکەکەی ببڕێ‌و ئیتر بڕیاری بەسەرهاتی خۆی ئەدات و لە نزیك خەربووتەوە ئەڕژێتە ( قەرەسۆ ) . وە دووای یەکگرتنی ئـــەو دوو رووبارە گەورەترین رووبار لـــە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دروست ئەبێت کە فوراتە ( ٢٦٧٠ فرسه قه )و هـەوڵ ئەدات کە بڕژێتە دەریای سپی ناوەڕاســتەوە و

---

(٣) لە بنج دا وشەی ( فورات ) لەگەڵ وشەی رووسی ( فارت پۆڤارتیلو ) دا یەك وشەن ، کە بـــەزمانـی سامی‌یەکان ( عەرەبەکان و ئەوانی تریش ) مانای ، پاشەکەوت ، دەوڵەمەندی ، زۆر و فرە ، دەگەیەنێ .

بەرە و خوارووی ـ رۆژئاوا ـ ئەڕوات ، بەڵام تۆرۆس بەری لێ ئەگرێ و نایەڵێ ، لەبەر ئەوە بەرەو رۆژهەڵات ئەڕوات و بە کەنداوی عەرەبی کۆنایی دێت .

بەڵام زنجیرەی دووەم کە بەرەو خوارووی ـ رۆژ هەڵاتی ئەسکەندەروونە درێژ ئەبێتەوە ، بریتیە لە بەردە ـ وامی چیاکانی ژووروووی سووریا و پێی ئەوولرێ زنجیرەکانی تۆرۆس و بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەرەو رۆژهەڵات درێژ ئەبێتەوە و لە نزیك دەریاچەی وانەوە زنجیرەیەکی بەرەو ژووروووی لێ جیا ئەبێتەوە . ئەوی تریشیان لە خوارووی رۆژهەڵاتدا دەریاچەکە بەرئەدات و نزیك ئەبێتەوە لە سنووری ئێرانی لەنزیك کۆتوراوە . وە لە رۆژهەڵاتی دەریاچەی وانەوە ، دۆڵی ئەم دەریاچەیە لە بەشی سەرووی زێی گەورە جیا ئەکاتەوە ( بڕوانە ئەمەی خوارەوە ) .

ئەم زنجیرەی دووایان بەرەو خواروو درێژ ئەبێتەوەو دوو زنجیرەی بەرزی تازە پێك دێنێ و دۆڵی بەشی سەرووی رووباری دیجلە ئەگرنە باوەش و بەرەو خوارووی رۆژهەڵات ئەرۆن ، بەڵام رووباری دیجلە پێش ئەوەی بڕژێتە ناو دەشتەکانەوە ، ناوچەی کەمتر لە رووباری فورات داگیر ئەکات .

چیای ( جودی ) کە ئەکەوێتە سەر کەناری چەپی

رووباری دیجلەوە کە ئەفسانە ڕۆژھەڵاتی یەکان وتوویانە ئەم چیایە جێگای لەنگەر گرتنی کەشتی یەکەی نوحە(×) بەڵام چیای جۆڵە مێرگ لەم بەرزترەو ئەکەوێتە سەرلای راستی رووباری دیجلەو زێی گەورەوە(٤)، کە ناگاتە بەشـــەکانی ســـەرووی دیجلەوە ، بەڵکـــو ئەرژێتـــە ناوەراستی یەوە .

ئەگەر بەشەکانی سەرووی رووباری فورات و ناوچە- کانی دەریاچـــەی وان ( ئەرمینیای کۆن ) مانای جێگا یاخود (خاکی) کۆن بێت کە کوردەکانی تیا دەرکە- وتووە ، ئەوا ئیتر من وا ئەزانم بەشەکانی خواروو لـــە تۆرۆس و کەنارەکانی لای چەپی دیجلـــە ( بـــۆتان ، خەربووت ، زێی ســـەروو ) ، لە ھەموو ســـەردەمە مێژوویەکاندا نیشتمانی یەکەمی گەلی کوردە .

ئەگەر ویستمان ھـــەر لە سەرەتای مێژووەوە باســـی نیشتمانی کوردەکان بکەین ئەبێ بچینە بەشەکانی رۆژ-

---

(×) ئەم وتەیە ئەفسانەی رۆژھەڵاتی نی یە ، بەلکو ئایەتی قورئانی پیرۆزی لەسەرە و خوای گەورە لەسورەتی ھـــود ئایەتی (٤٤) دا فەرموویەتی ( وقيل ياأرض ابلعي ماءك وياسماء اقلعي وغيض الماء وقضي الأمر واستوت على الجودى وقيل بعداً للقوم الظالمين ) .

(٤) وشەی ( دیگلاتی ) بابلی مانای ( بەری بەرزە ) .

هەڵاتی دووروو خواررووەوە . ئەم سێ ناوچەیەی خوارەوە نیشتمانی کوردەکانن . زنجیرە چیا بەرزەکانی ئەرمینیا ، کوردستانی تورکیا ، چیاکانی رۆژئاوایی ئێران ، بەم شێوەیە ئەبینین ، ئێستا کوردەکان لە خاکێکی فراواندا ئەژین ، هەر لە سنووری تورکیا و فارس و کوردستانی عێراقەوە هەتا ئەگاتە ئارارات کە خاکیان لە سنووری ئێمە تێپەر ئەبێ و دێتە ناو قەفقاسمانەوە کوردەکان لە هەموو زنجیرە چیاکانی ئەرمینیادا لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا ئەژین و سنووری ژووروویان لە تورکیادا لە پەنای ئەرز رووم دا کۆتایی دێت : لە خوارووشدا کوردەکان

سروشتی کوردستان لە زستاندا

دەستیان بەســەر ناوچەیەکی فراوانــدا گرتووە ، هەتا ئەگاتە کۆتایی دەشتەکانی نێوان دوو رووبار ، لە رۆژ- ئاواشەوە سنووریان رووباری فووراتە ، یاخود بەشێوەیەکی وردتر قەرەسۆ ، وە ئەوان لەم سنورەدا نەوەســتاوون بەڵکو رۆشتوون بۆ قولایی ئاسیای بچوك و تەنها ناوچەی خواروی رۆژهەلاتی سواسیان داگیر نەکردووە ، بەڵکو هەتا نزیکی قونیە لە کلیکیەدا کۆمەڵی جیا جیایان هەیە ، بەم شێوەیە ئەگەنە دەریای سپی ناوەڕاست .

بەشێوەیەکی گشتی ئەتووانین بڵێین کوردو چیا لێك جیا نابنەوە ، هەر لەگەڵ دەشــت دەستی پێ کرد ئیتر کوردەکان بەجێی دێڵن بۆ عەرەب و تورك ، تا نزیکی دەریاچەی وانیش بۆ ئەرمەنیەکان .

بەلام لە رووی ئیداریەوە کوردەکان لەم ناوچانەی خوارەوەدا دائەنیشن :-

**لە رووسیادا :-**

کوردەکان لە ناوچەی ئەریڤان ، لەو بەشــانەدا کە ئەگەنە ئارارات دائەنیشن ، هەروەها لەگەلێ ناوچــەی تری دەوورووو بــەری ئەردەهان و قاقزمان لــە ناوچەی قارسدا ، ســەرەڕای ئەوەش کوردەکان لــە ناوچەی زەنگەزوور و جوانشیر (ئارش و جبرائیل) لە ناوچــەی (ئەلیزابث پول) دا ئەژین ، ئەوەی پێویستە دەستی بـۆ رابکێشین ئەوەیە کە کوردەکانی ئەم ناوچانە لە سەر- ژمێرییەکەی ئەم دووایيەی دانیشتوواندا وەکو کـورد نەنووسراوون ، ژمارەی کوردەکانی ئـەریڤان و قارس

له سالی ۱۹۱۰ دا ، ۱۲۵ هـەزار کەس بـوون کە ۲۵ هەزاریان یەزیدی بوون .

له ئێراندا : ـ

کوردەکان له هەموو بەشەکانی ناوچەی کرماشان و کوردستان ( سنه ) دا دائەنیشن ، وه له ناوچەی گارووس و بەشـێکی ئازربایجان و هەمـوو ناوچەکانی سـابلاغ ، ( مەهابادی ئێستا ـ مارف ) ، له خوارووی دەریاچـەی ئۆرمیە و رۆژئاوای رووباری تاتاودا ، لـەو هێڵەوه کە کە ماوەیەکی زۆر درێژ ئەبێتەوه تا نزیکی سـنووری تورکیا له بەشەکانی خوارووی ورمێ و سەلماس و خۆی و ماکۆدا(۵) ، کوردەکان له دانیشتووەکۆنەکانی ناوچەکانی خواروون ، وا ئەزانم ئەمانه راسـتەوخۆ لـه نـەوەی میدی‌یه کۆنەکانن ، ئەوانەی له ناوچەکانی رۆژئاوای ئەم ولاتەدا ژیاوون بەڵام ئەو کوردانەی کە له بەشەکانی خوارووی رۆژهەڵاتدا دائەنیشن له زمان و ئایین دا لەگەڵ ئەو جەماوەره هاوڕەگەزەی خۆیاندا جیاوازن ( ئەمانـه شیعەو عەلی ئیلاهی ) ن ، وه هەر خۆیان ئەوه دووپـات ئەکەنەوه کە هەموویان لەیەك گەلن ، بـەڵام ئـەوەی

(۵) ئەمارەتی یاخانیەتی ئاواجیك یـەکەم ناوچەیه کە تورکی زۆری تیایە ( هۆزی ئیرومێلی و هینی تریش ) و کوردەکانیش لەو ناوچە سنووریانەدا دائەنیشن کە کوردستانی پەتین .

پەیوەندی بە بەشەکانی ژووررووی وڵاتی ئێرانەوە هەبێت ، ئەبێ بۆ نموونە بڵێین ، لە یەکەم سەدەکانی زاینیدا سەلماس (٦) ، ناوچەیەکی سەربەخۆ بووەو ئەرمەنیەکان پێیان وتووە ( کورتچیا ) بە مانای ( کوردستان ) ، بەڵام دەربارەی بەشەکانی خوارووی دەریاچەی ورمێ تاڕادەیەك کوردەکاز لەم سەردەمانەی دوواییدا تیا دانیشتوون ، لە ناوچەی سابڵاغ دا تاکو ئێستاش بەردەوام ناوە تورکی - یەکان هەر ماوون(٧) ، لەسەروو ئەمانەشەوە سەرچاوە کوردییەکان بەشێوەیەکی ئاشکراو روون دەری ئەخەن کە دەرکەوتنی هۆزەکانی موکری ( خزمەکانی هۆزی بابان لە سلێمانی ) لەکاتی فەرمان ڕەوایەتی دەسەڵاتی مەڕی ڕەش و مەڕی سپی دا بووە ، یاخود لە دەوورووبەری سەدەی پانزەهەمی زاینیدا .

سەرەڕای ئەو ناوچانەی باسمان کردن کە بەناوچەی کوردی پەتی دائەنرێن ، لە وڵاتی ئێراندا کۆمەڵی کوردی بڵاو بڵاو لە ناوچەی جۆر بەجۆردا هەن :- لە خۆراسان ( شادیلی ) لە ناوچەکانی ژووررووودا لە قەزوین (ئەمیرلو ) ، لە دەوورووبەری شیرازدا ( گالۆن عەبدۆ )

---

(٦) ئەدۆنتس ، ئەرمینیا لە سەردەمی جوستنیان ، لاپەڕە ( ٤١٨ ) بەزمانی رووسی .

(٧) شتێکی سروشتیە کە جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئەم ناوە کوردیو تورکیانەدا هەیە ، بیژاو ، دولکان ، کانی سپمان ، گرتك سپی ، زارکێو ..... هتد .

که نادرشا لەساڵی(١٧٣٦-١٧٤٧)دا بەزۆر گواستونی‌یەتەوە.

**لە تورکیادا :-**

کوردەکان بەشێوەیەکی گشتی‌و بنەڕەتی لە بەشەکانی خوارووی تورکیادا دائەنیشن ، بەڵام لە ناوچەی وان‌و بەتلیس دا ئەرمەنی‌یەکان بەشـــی زۆری دانیشتووانـی ناوچەکەن‌و نزیکەی ٦٠ــ ٧٠٪ ( ئەمەش پەیوەنـــدی بەو خاکەوە هەیە کە لە دەورو پشتی دەریاچەی واندابەو ئاویان تیایە )

بەڵام سنجاقی هەکاری کە بەرەو ســـنووری ئێران درێژ ئەبێتەوەو هەروەها بەشی زۆری ناوچە شاخاوی‌یەکان لە هەردوو ویلایەتەکەدا بەشی زۆریان کوردن ، هۆزە نەستووری‌یەکان لە خوارووی هەکاری ( جۆڵەمێرگ ) دا ئەژین لە ناوچەیەکی بچکۆلانەی داخراودا و لە ٩٠٪ی دانیشتووانی ئـــەو ناوچەیەیان پێك هێناوە و دەســـتیان بەســـەر وەزعەکەدا گرتووە ، کوردەکان لـــە هەردوو ویلایەتی دیاربەکر و خەربوت‌دا بە ژمارە لـــە هـــەموو نەتەوەکانی تری ئەوێ زۆرترن و شـــاری ( جەزیرە ) ئەکەوێتە ویلایەتی دیاربەکر ، لەسەر رووباری دیجلە لە ناوچەی بۆتاندو(٨) بەلانکی نەتەوەی کورد دائەنرێت ،

---

(٨) ئەم ناوچەیە کە لە زۆر شوێنی فراوان لە بەشەکانی خوارووی دۆڵی بۆتان پێك هاتووە ، یەك ناوچەی ئیداری نی‌یە ، وەکو ( م . هارتمان ) وتوویەتی ، بەڵکو بەشکراوە بەسێ ویلایەتەوە .

لەویٚوە بڵاوبوونەتەوەو لەوێشەوە بزوتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد سەری هەلداوە ، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە ویلایەتی خەربووتەوە هەبێت ، بێگومان پێویستە باسی دانیشتووانی ناوچەی دەرسیم بکەین ، کە ئەکەوێتە نێوان ئەو دوو رووبارەوە کە فوراتیان پێك هێناوەو کوردەکان لەم ناوچەیەدا هەشت یەکی نەتەوەکانی تری ئەوێ ئەبن و ئەمانە بەزمانی کوردی قسە ئەکەن ، بەڵام بە شێوەی (زازا) (٩) ، وە ئاینێکی تایبەتیان هەیە ، هەر ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی هەندێ کەس وابزانن کە ئەمانە کورد نین ، بەڵام من وا ئەزانم ئەم بۆچوونە راست نی‌یە ، چونکە ئەوانە بەو زمانە کوردی‌یە ئەدوێن کە بەش کراوە بە چەند شێوە زمانێکەوە ، بنەڕەت و شێوەی ژیانی کۆمەڵایەتی‌یان کوردی‌یە ، هەروەها هۆزی کوردی تریش هەن کە هەر ئاینی (عەلی ئیلاهی) ئەمانیان هەیە .

---

(٩) وا ئەزانم کە شێوە زمانی ( زازا ) نازناوە : بە زمانێکی ئەڵێن کە لە دەوروپشتی خۆیاندا نەیزانن، ئەم شێوە زمانەش (بەگوێرەی ئەو لێکۆڵینەوە تازانەی کە ئوسکارمان) کردوونی ، شێوەزمانێکی ئێرانی تەواوە و پەیوەندی بە خێزانی ئەو شێوە زمانانەوە هەیە ، وەکو گۆران ، کە گەلێ سیفەتی تایبەتی خۆی هەیە ، ئەوەشمان لە بیرنەچێ کە ئەو ئەفسانەیەی ئەڵێ ئەم شێوە زمانە پەیوەندی بە ئەرمەنی‌یەکانەوە هەیە ، هیچ راستی و بنەڕەتێکی نی‌یە .

جا بۆ دەرخستنی ئەو ناوچانەی کوردەکانی تورکیای تیا دائەنیشن ئەتوانین پەنا بەرینە بەر نەخشەیەك کە نەخشە بەناوبانگەکەی ناو کتێبی ئەندامی ئەنجومەنی گشتی بەریتانیایەو نەخشەی (مارك سایکس)ە(١٠) کە بە یەکێك لە

(١٠) ( هۆزە کوردەکان لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا ) گۆڤاری کۆمەڵەی شاهانەی ئاسیا ژمارە ، ٣٨ ، ساڵی ١٩٠٤ ، لاپەڕە ، ٤٥١ ـ ٤٨٦ ، بە زمانی ئینگلیزی ، بێگومان ئەم کارەش پێویستی بە چاپێکی تازە و پوخت کراو هەیە . لەگەڵ سەیر کردنی هەموو ئەو سەرچاوانەدا کە لەم رووەوە دەربارەی کوردیان نووسیووە ، شێوەو جۆری رێکخستن و دانانی نەخشە کە بە ئاشکرا روونی ئەکاتەوە کە نووسەر ویستوویەتی پراکتیکی بێت ، هۆزەکان بەشکراوون بەسەر پێنج ناوچەی جوگرافی تەواوداو نووسەر بە پیتی گەورە نیشانەی بۆ داناوون ، بەلام شوێنی دانیشتنی هۆزەکان لەم ناوچانەدا بەتیپی بچووك نیشانە کردووە و بۆ بەکارهێنانی نەخشەکەش کەتەلۆگێکی دووروو درێژی دەربارەی هۆزەکان داناوە .

ئێمە وائەزانین کە ئەتوانرێ ئەو نەخشەیە تەنها بۆ جیا کردنەوەی ئەو ناوچانە بەکار بهێنرێ کە کوردەکانی تیا دائەنیشن ، بەلام نەستووری یەکان بە نیشانەی خاچ دیاری کراوون ، خۆ بە هیچ جۆرێك باسی ئەرمەنەکانیشی نەکردووە ، ئەبێ ئەوەش بزانین

نەخشە بەناوبانگەکەی (م · سایکس ۱۹۰۸) کە کوردستان بەگشتی لەسەردەمی‌دەوڵەتی عوسمانیدا دیاری ئەکات · پیتەکـان :ــ ئـەو ناوچانەن کـە کوردی تیـا دانیشـتووە · ژمارەکان :ــ ئەوناوچانەن کە هۆزەکان لە زسـتان‌و هاویندا سـەریان لێ داوە · خاچەکان :ــ ئەوناوچانەن کە نەستوریەکانی تیا دانیشتووە ·

شارەزایانی ئەنتۆگرافیای کوردەکان دائەنرێ ـ بەتایبەتی کوردەکانی تورکیا .

زانیاری سەرژماردنی تری زۆر هەن کە دەربارەی ئەرمەنی‌یەکان و کوردەکان و نەتەوەکانی تریش لە بڕوانامەی رەسمی وەزارەتی دەرەوەدا بڵاوکراونەتەوە (الاصلاحات في أرمينيا ١٩١٥) .

---

← کە نەخشەکەی عەقید کارتسوف لەم رووەوە زۆر باشترە ، وە ئەبێ م . سایکس و ، ت . م . سایکس ، قونسوڵی گشتی لە مەشهەدا کە نووسەری کتێبی (دە هەزار میل لەوڵاتی ئێراندا) یە لێك جیا بکەینەوەو تێکەڵاویان نەکەین .

## مێــــژووی کــــورد

ره‌گه‌زو نه‌ژادی کورده‌کان ، یان به‌واتایه‌کی ووردتر یه‌که‌م ده‌رکه‌وتنیان له‌ کوردستاندا ، مه‌سه‌له‌یه‌کی کۆنه‌و تاکو ئێستاش گه‌لێ موناقه‌شه‌ی له‌ســـه‌ر ئه‌کرێ و ڕای جیا جیای له‌سه‌ر دائه‌نرێت ، له‌ کتێبی کلاسیکیه‌کاندا (١) کاتێك باسی خاکی کوردستانی ئێستا ئه‌که‌ن ، باسی زۆر ناو ئه‌که‌ن ، که‌ به‌شێوه‌یه‌کی ورد له‌ وشه‌ی (کورد) ئه‌چن . تا ماوه‌یه‌کی نزیکیش له‌مه‌وبه‌ر ، وا بڵاوبوو که‌ کورده‌کان نه‌وه‌ی ئه‌و کاردۆخیانه‌ن که‌ که‌زنه‌فوون له‌ ساڵی ٤٠١ی پێش زاین‌داو کاتێك سه‌رکرده‌ی (١٠)ده‌ هه‌زار یۆنانی کردووه‌ بینیونی‌و په‌یوه‌ندی پێوه‌ کردوون ، به‌ڵام ئه‌م بیروڕایه‌ له‌م ماوه‌یه‌ی دواییدا گۆڕا ، چونکه‌ هه‌ندێ له‌ زانا تازه‌کانی ئه‌م سه‌رده‌مه‌ ئــه‌و گه‌لانه‌یان

---

(١) وا ئه‌زانم مه‌ســه‌له‌ی ده‌رکه‌وتنی کورده‌کان لــه‌ بڕوانامه‌ مێژوویی‌یه‌کاندا تاکو ئێستاشی نه‌کراوه‌ته‌وه‌ ، ناوه‌ کۆنه‌که‌ی (کۆرتی) ئێستا به‌ (کۆرخی)دائه‌نرێ (سه‌یری هارتمان بۆتان ، به‌شی دووه‌م ، لاپه‌ڕه‌ ، ٩٢ بــکه‌) .

کردووه بە دوو بەشەوە کە پەیوەندی‌یان بـەو ناوانەوە هـەیـە : ـ

بەشی یەکەم :ـ (بەشێوەیەکی تایبەتی کاردۆخی‌یەکان)، وایان پێ ئەڵێن کە گوایە لە ڕەگەزدا ئاری نین(٢)، بەڵام ئەو کۆرتیانەی لەبەشی ڕۆژهەڵاتی وڵاتی کاردۆخی‌یەکاندا ئەژین داناوە بە باوباپیری کوردەکان .

ئیتر مەسەلەکە هەر چـۆن بێت ، ئەو گەلەی ئێمـــە دەربارەیان ئەنووسین ، پێش زاین بە چەند سەدەیەك لە چیاکانی کوردستاندا دەرکەوتوون . ئێمە زۆرباش ئەزانین کە کوردەکان لــەرووی زمانـەوە ئاری نین ، بەڵکـــو زمانەکەیان ئەچێتـە ناو کۆمەڵی زمانە ئێرانی‌یەکانەوە ،

(٢) ئاکادیمی (مار) وا ئەزانێ ناوی (کاردۆخی) هەر لە رواڵەتــدا دەری ئەخات کە ئــەم گەلە لەگەڵ ئۆرارتیەکاندا (ئەوانەی کە بــە خۆیان ئــەووت خالیدی‌یەکان) یەك ڕەگەزن ، بەڵام زمانە کۆنەکە لەم دوویيەدا هەر لــە بنەڕەتەوە گۆڕاوە بە زمانی هیندۆ ـ ئەورووپی سەیری (جارێکی تر دەربارەی وشەی چەڵەبی) بکە ، لە نووسینەکانی بەشی ڕۆژهەڵات لە کۆمەڵەی ئەرکیۆلۆجی ئیمپراتۆری‌یەتی رووسی ، ساڵی ١٩١٢ ، بەندی ، ٢٠ ، لاپەڕە ، ١٣٩ ، بــە زمانی رووسی ، بەڵام دەربارەی پەیوەندی کۆرتیەکان بە کاردۆخیەکانەوە (مار) وا ئەزانێ لەو مەسەلانەیە کە بڕیار لەسەردانی شتێکی گرانە .

لەسەر ئەم بناغەیە من وا ئەزانم کە وڵاتو (زمانەکەشیا) لـــە ڕۆژهـــەڵاتدایـــە(٣) .

ئەگەر زانیمان یەکەم هێرشی کۆچ کردنی ئاریەکان لـــە نزیکی سەرەتای ســـەدەی حەوتەم پێش زاینی دا رووی داوە ، ئیتر ئەبێ وابزانی و سوریش بی لەســەر ئەوەی لەو ماوەیەدا کە میدیەکانو هاوپەیمانەکانیان لە ساڵی ٦٠٧ی پێش زاینیدا دەستیان بەسەر ئاشوریەکاندا گرتووە ، ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشتوون ، ئەمەو ئەوەی شـایانی باســـە ، ئەوەیە کە نزیکترینو کۆنترین دراوسێیان ئەرمەنیەکان بوون و ئەمانیش هـەر لـــەو ماوەیەداو لـــە ( مزبگیا ) سەریان هەڵداوەو وڵاتی ئورارتۆیان داگیر کردووە(٤)، ( ئەمانەش

---

(٣) وا ئەزانرێ کۆچی گشتی ئاریەکان بۆ ئێران لە ڕۆژئاواوە بـۆ ڕۆژهەڵات رووی‌داوە ( ڤ . ڤ . بارتولـــد ، باسێکی جوگرافی ، مێژوویی ئێرانە ، ١٩٠٣ ، لاپەڕە ، ٣ ـ ٥٩ ) بەزمانی رووسی .

(٤) هەندێ لە زاناکان رەگەزی ئوراتیەکان وەکو ئێستا پێیان ئەڵێن خالیدیەکان : ئەبەستن بـــە خێزانی ئەرۆدیـــە تایبەتیەکانی گەلی ـ هیتیـــەکان و میتانیەکان و بەهریەکانەوە ، ( سەیری ب . أ تورایێف ـ مێژووی ڕۆژهەڵاتی کۆن ، بەشی دووەم ، لاپەڕە ، ٤٦ و دواییەکانی لە ساڵی ١٩١٤ دا ، بە زمانی رووسی بکە ) .

گەلێکن لە ڕەگەزێکی تر ) و لە دەورووپشتی دەریاچەی واندا ولاتەکەی خۆیانیان دامەزراندوە(٥) ، لەسەر ئەم بناغەیە ئەبینین ئەگەر رەگەزی ئەرمەنیەکان لە سەرووی رۆژئـاواوە بێت ، ئـەوا رەگەزی کوردەکان لـە رۆژهەلاتدایە و لـەم دوو هێرشەش تۆرۆسی کردووە بـە دوو بـەشـەوە .

ناوی کوردەکان بە شێوەی سەربەخۆ ، لە حکومەتە فارسییە کۆنەکانـدا نەهاتـووە ، لەوانەشە ئەوانـە لـە ناوچەکانی ئەرمینیادا بووبن .

زانا جوگرافییەکان ( سترابۆ ، پتولیمی و خەڵکانی تریش ) لە سەرەتای سەدەکانی زاینیدا بە شێوەیەکی چاك ناوچەکانی ( کوردۆئیەکان ) شارەزا بوون ، لـەو ناوەدا شارێکی بچووك هەبووە ، پێیان وتووە ( پیناك )و تاکو ئێستاش لەسەر رووباری دیجلەدا هەرماوە و پێی ئەڵێن ( فینیك )(٦) ، ئێستا ئەتوانین بەرانبەریی لە نێوان

---

(٥) لەم رووەوە تیوری تر هەن ئەڵێن پەیوەندی لە نێوان ئەرمەن و هیتی و کیمیرییەکاندا هەیە ( سـەیری خالاتیانتسی ، دەربارەی مێژووی ئەرمینیا ، ١٩١٠ ، لاپەڕە ، ١٠ ـ ٢٠ ، بە زمانی رووسی بکە ) .

(٦) ئەگەر پێویست بێ پشتگیری ئەو رایە بکرێ کە ئەڵێ جیاوازی لە نێوان کاردۆخی و کۆرتیەکاندا ، هەیە ، ئەوا ئەبێ لەم حاڵەتەدا وتەکەی (سترابۆ ) مان لەبیر نەچێ ، ١٦ ، ٧٤٧ ، کە ئەڵێ ئـەو نـاوچـەیـەی کوردۆئیەکانی تیایە ( ئەوناوچەیەی شـاری پیناکی تیایـە ) لـە سـەردەمە رابوردووەکاندا ولاتی کاردۆخییەکان بووە ( هارتمان بۆتان ) .

وشەی ( کوردۆئیەکان ) و وشـەی ( کورچیا ) ـ وڵاتی کوردەکاندا ـ بکەین ، ئەوەی کە لە لایــەن ئەرمەنە ئەرشاکیەکانەوە باس کراوە ، ئەوەی کە لە سەلماسەوە بەناو بەشەکانی خوارووی هەکاری داو دووایی بەرەو رۆژئاوا هەتا بۆتان درێژبۆتەوە(٧) .

جیاوازی تیورەکان دەربارەی چارەنووسی ئەم ناوچەیە هەر چۆن بێت ، واقیع یەك راستی دەرئەخات ، کە لە شامواوە وەری گرتووە ، ئەویش ئەوەیە کە بەشەکانی خوارووی رۆژهەڵاتی کوردستانی ناوەڕاست کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی خێزانی هایکانی ـ ئەرمەنی یەکانەوە ـ ئەمانە سەربەست بوون و نەئەکەوتنـە نــاو دەوڵــەتی ئەخمینیەکانەوە ، دووای ئەوە سەری بۆ ئەسکەندەری گەورەو ، ئەرمەنە ئەرشاکی یەکانو ئەسکەندەری کوڕی مــارك ئەنتۆنی و کیلۆباترا و پارڤی یەکان و رۆمــان و ساسانی یەکانو (ئەردەشێرو شاپۆر)و قەشەی رۆمانی یەکان ، هەر لــە جالیری یەوە هەتا جولیان و جارێکی تـر بــۆ ئیمپراتۆری یەتی بێزەنتی فیۆدۆس و بۆ ئـەو عەرەبانەی کە ئەمارەتی ئەرمەنەکانیان داگیر کردوو لە دووایيـدا بۆ یەکەم خێزانی کوردەکان ـ مەروانی یە سەربەخۆکان کە لە سالی ٩٩٠ تا ١٠٩٦ی زاینی حوکمیان کردووە ، دانــەنــەوانــدووە .

لە راستی دا ئەم ناوچانە ئەمن و ئاسایشیان تیا نەبووە ،

---

(٧) ئەدۆنتس ، ئەرمەنســتان لـە سەردەمی جوستیاندا ، لاپــەرە ، ٤١٨ .

هێرش و داگیرکردنی ڕۆژهەڵاتی تری تیا ڕوودەوە ، لە سەدەی یانزەهەمدا سەلجوقیەکان ناوچەکەیان داگیر کردووە . دووای ئەوە کوردەکان ناچار کراوون ، کە تێکۆشن ، تێکۆشانێکی توندو تیژ لە دژی مەغۆلیەکان ، وە لە سەدەی سیانزەهەمدا لە دژی هۆلاکۆخان و دووای ئەوە لە دژی تەیموری لەنگ کە لە دەورووبەری ساڵی ١٤٠٠ی زایینیدا چارە نووسیان لە کوردستانداو بەتایبەتی لە دەورو و پشتی ئامێدی خۆیدا تێ شکان بووە .

لە کۆتاییدا و لە سەدەی شانزەهەمی زایینیدا داگیر کەری تر ، لە ڕۆژئاواوە دەرکەوتن ، ئەمانیش تورکە عوسمانییەکان بوون ، وە لە ساڵی ١٥١٤دا چارەنووسی کوردستان بەسترابوو بە عوسمانییەکانەوە(٨) .

سوڵتان سەلیم دووای داگیرکردنی کوردستان ئیتر ئیدارەی کوردستانی خستۆتە ژێر دەستی پیاوێکی نزیکی خۆیەوە کە ئیدریسی(٩) زاناو مێژوو نووس بووە و لە

(٨) یاخوود دووای شەڕی چالدیرانی بەناوبانگ ، کە تورکە عوسمانییەکان دەستیان بەسەر ناوچەیەکی فراوانی کوردستانی ژووروودا گرتووە ـ مارف ـ .

(٩) لەوانەیە ڕای گشتی و زانستیانەی کوردەکان لەسەر ئەم پیاوە ڕاست نەبێ ـ کە وتوویانە گوایە ئەم پیاوە خیانەتی لێ کردوون ، چونکە لە داگیر کردنی بەشەکانی ژووروی کوردستاندا یارمەتی سوڵتانی

کورده کانی بەتلیسە(١٠)، وە هەندێ کەس ڕایان وایە لەبەر چەند هۆیەکی سیاسی ئیدریسی زانا کوردەکانی گواستۆتەوە بۆ ئەو ناوچانەی کە ئەرمەنییەکانی تیادائەنیشن ، بەڵام لەوە ڕاست تر ئەبێ بووترێ کە کوردەکان پێش ئـەو ماوەیە بەکاتێکی درێژ لـــەو ناوەندەدا بڵاوبوونەتەوە ، بەڵام ئەوەی کە بەشێك لەم هۆزانە کۆچەر بوون ڕاستە ، بەڵام بەشەکەی تری لە پاڵ ئاینی ئیسلامیدا بـوو ، کە لەو ناوچەیەدا بـــڵاوبوو بووەوەو دژایەتی گاورەکانی ئەکرد ، لێرەدا ئەبێ دەست بۆ ئەوە ڕابکێشین کە بـاو باپیری سەلاحەددینی مەزن کە لە هۆزی ڕەوەندی بووە ، لە سەدەی دەهەمدا لە دەورووپشتی قـەڵای (دوین) ی سەر بە ناوچەی ئەرێڤاندا(١١) ، باروو بارگەی خۆیانیان خستووە ، سەرچاوە کوردییەکان ، وا باس ئەکەن کە هۆزی ڕۆژەکی بەتلیسی داگیر کردووەو ســـەرپێچی

---

←

عوسمانییەکانی داوەو ، لە ناو کوردەکاندا بووەتە نموونەی خیانەت کاری ـ بەڵام من وا ئەزانم ـ کە کاتێکدا کە لەسەر ئەو پیاوەش ناکەمەوە ـ ئـــەم مەسەلەیە پێویستی بە لێکۆڵینەوەو پشکنینی ووردوو زانستیانەی هێمن هەیە ـ مارف ـ.

(١٠) کتێبی شەرەف نامە ، بەشی ، سێیەم . لاپـــەڕە ، ٢٠٨ ـ ٥٣١ ، چاپی پیترسبورگ .

(١١) سەرچاوەی پێشو ، بەشی دووەم ، لاپەڕە ، ٧٦ .

ئەمیر داودی جورجیەکانیان کردووە ، هەر لەم سەرچاوانەدا وا هاتووە کە هەر لە ساڵی ٨٧٣ی زایینییەوە خێزانە کوردەکان لە بەتلیس دا فەرمان ڕەوایەتیان کردووە ، وائەزانم ڕاستر ئەبێ ئەگەر ژمارەی ترمان خستە سەر ئەم ژمارەیە ، یاخود ئەتوانین بڵێین ، ئەم ڕووداوانە لەسەدەی دەهەمو پانزەهەمدا ڕوویانداوە(١٢) .

بێگومان کوردەکان بە شێوەیەکی بەردەوام هەندێ

(١٢) سەرچاوەی پێشو ، بەشی سێیەم ، لاپەڕە ، ٣٤ ، ٢٢٤ ، وەرگێڕراو ( ئەم ڕووداوانە تاکوئێستاش لە مووش و کابهلجوسدا لەناو کوردەکاندا هەر هەیە ) ، سەیری وتاری سایکس شارموا ، بەشی چوارەم ، لاپەڕە ، ٢١٣ ، بکە ، ڕوونی ئەکاتەوە کە داوودی ناوبراو کوڕی سینیهیرم بووە ، لە خێزانی ئەرمەنە ئەرتسیرۆنییەکانە کە لە ساڵی ١٠٢٧ دا وازی لە تەخت هێناوە ، بەلام لە لایەکی ترەوە بڕوانامە مێژوویەکان وا ئەگەیەنن کە ناوبراو ئەمیرێکی گورچی بووە ، خۆ ئەگەر مەسەلەکە وابێ ، ئەوا ئەبێ (داوود کوپلات) مان بێتەوە یاد کە لە ساڵی ١٠٠١دا مردووە ، بڕوانامە مێژوویەکەی جیاوەزی لە نێوان ئەرمەنیو گورچییەکاندا ئەکات بۆ نموونە، بڕوانامەکەی ئەوەی دەرخستووە کە کەنیسەی ئەرمەنەکان بووە بە مزگەوت ( بەشی سێیەم لاپەڕە ، ٢١٥ ) .

ناوچەی فەرمانڕەوایەتی ئەرمەنیەکانیان داگیر کردووەو ئەم داگیر کردنە لە سەدەی پانزەهەمدا کۆتایی هاتووە، لەبەر ئەوە لە زۆر شوێندا ئەمانە لەسەر خاکی تایبەتی خۆیاندا ناژین، بەڵام پێویستە ئەوەمان لەبیر نەچێ کە ئەم مەسەلەیە تازە نی یە، بەڵکو رەگی مێژوویی دوورودرێژی هەیەو، واقیعیش پشتی ئەگرێ، چونکە ئەرمەنستانی کۆن لەم رۆژانەی ئێمەدا لە رووی ئەنتۆگرافیاوە کوردی - ئەرمەنی یە.

سەرچاوەی کوردی گەورەو بڕوانامەی مێژوویی گرنگ کە کتێبی شەرەف نامەیە، لە کۆتایی سەدەی شانزەهەمی زاینیدا دەرکەووت و دەربارەی ئەمارەتە کوردی یەکان - کاتی فەرمانڕەوایەتی سوڵتان سەلیم - گەلێ زانیاری گرنگ و چاکی تیا باس کراوە.

کەناری چەپی رۆژئاوای رووباری فورات و هەموو ناوچەکانی کەناری رۆژهەلاتی ( مرادسۆ ) ، تاڕادەیەك لە ژێر دەسلاتی فەرمان رەوایەتی ئەمارەتە کوردی یەکاندا بووە، ئەو ئەمارەتانەی کە ئەیانوت ئێمە لە رەگەزی ئەو هۆزانەین کە دووای بلاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام لەم ناوچەیەدا دانیشتوون، ئەمارەتی بەتلیس گەورەترین ئەمارەتیان بووەو ئەمیرەکەیان نووسەری شەرەف نامە بووە، کە بەدرێژی باسی شارستانی یەت و دەسکەوتی ئەمارەتەکەی لە مزگەووت و بازاڕو زانستی، . . . . . . . . ، هتد، تیا نووسراوە.

ئەم سەرچاوەیە باسی رەگەزی کوردەکان ئەکات و شـــانازی پێوە ئەکات ؛ باسی خووڕەوشتیان ئەکات و وێنـــەی رووداوی شــەڕو هاتووچووی کۆچـــەرایەتی هۆزەکانیانو تێکۆشانی بەردەوامیان دژی تورکیاو ئێران ئەکێشێ ، بەم شێوەیە هەتا ئەگاتە رۆژانی ســـەردەمی خۆی ـ رووداوە مێژوویەکان ـ ئەگێڕێتەوە .

دەربارەی خۆشەویستی کوردەکان بۆ سەربەستی لە شەرەف نامەدا وا باس کراوە کە ( سوڵتانە بەهێزەکانو ئەمیرە گەورەکان نەیان توانیووە دەست بەسەر خاك و نیشتمانی کوردەکاندا بگرن ، کوردەکان دیارییان پێشکەش ئەکرد بەسوڵتانەکانو ئیتر هەر ئیشێکیان لێ داوا بکردنایە بۆیان ئەکردن ، ئەگەر پێویستیان بە سوپاش هەبووایە ، ئەوا سوپای ئیحتیاتیان ئەدانێ(١٣) .

بەڵام ئەم حاڵەتە لە سەدەی نۆزدەهەمدا و لەکاتێك‌دا پیاوچاکی گەورەی تورك ســـوڵتان مەحموودی دووەم بڕیاری سوڵتان سەلیمی دەربارەی کوردەکان دایەدوواوەو کۆتایی هات ، یان بە شێوەیەکی روونتر ویستی کوردستان سەرلەنوێ داگیر بکات و بڕیاری‌دا کاروباری شـەڕیان لە دژ بکاتو لە ساڵی ١٨٣٤ دا ئەمەی بــۆ کرا ، کە محەممەد رەشید پاشا سەرکردایەتی هێرشەکەی کرد ، لە دووایی‌دا کوردەکان راستەوخۆ بووبێ یان ناڕاستەوخۆ ، بوون بە هاوڵاتی ژێر دەستی فەرمانڕەوایەتی دەوڵـەتی عــوســـمانی .

---

(١٣) هەمان سەرچاوە ، بەشی دووەم ، لاپەڕە ، ٣٤ .

داگیر کردنی تازەش هۆیەك بوو بۆ ئەوەی کوردەکان لە ساڵی ۱۸٤۳ ـ ۱۸٤٦ دا بە سەرۆکایەتی بەدرخـــان پاشا ، یەکەم بزوتنەوەی نەتەوایەتیان هەڵبگیرسێنن ، بەڵام بزوتنەوەکە سەرنەکەوت ، چونکە حوکومەتی عوسمانی سوپایەکی بەهێزی نارد بۆ سەر کوردەکان و بەسەریانا سەرکەووت ، لە ئەنجامی ئەوەدا بەدرخان ، بەدیل گیراو دووریان خستەوە بۆ جەزیرەی کرید .

وە لە رۆژانی جەنگی قرمدا بزوتنەوەیەکی میللی تر بەسەرکردایەتی یەزدان شیر کە لە خزمەکانی بەدرخان پاشای ناوبراوە تەقی یەوە .

کاتێك کە سوپای تورك بە نیازی شەڕ لە دژی رووسیا بەرەو ژووروو جوڵا ، یەزدان شیر لـە ساڵی ۱۸۵۵ داو لە هەکاری و بۆتاندا بزووتنەوەکەی بەرپاکردو بەتلیس و موسڵی داگیر کردوو ، بەرەو خوار شۆڕ بوەوە تا دەستی گرت بەسەر هەموو ئەو ناوچانەدا کە ئەکەونە نێوان وان و بەغدادەوە ، تێشکانی سوپای تورکی لە ناوچەی سعرت دا زۆر توند بوو ، وە خەڵکێکی زۆر لە فەرمانبەرو سەربازانی تورکەکان کوژران ، ئـــەوەی شایانی باسە ئەوەیـە کە بزوتنەوەکە دژی گاورەکان نەبوو ، بەڵکو بە پێچەوانەوە نەستووری و یۆنانی یەکانیش کە لە کوردستاندا ئەژیـان راپەڕین و لە ژێر ئاڵای یەزدان شیردا شـــەڕیان کرد . یەزدان شیر گەلێ جار پەیوەندی کرد بە رووسەکانەوەو پیاوی نارده لایان و پێشنیاری بۆ کردن کە پەیـــوەندی

بکات بە سوپای ئێمەوە ( یانی سوپای رووسی ـ مارف )
بەڵام هیچ وەڵامێکی وەرنەگرتەوە .

جا پێش ئەوەی ئێمە لە بەهاریساڵی ۱۸۵۵ دا دەست بکەین بە کاروباری جەنگ ، یەزدان شیر لە ئەنجامی پەیمانێکی درۆدا کە جاسوسێکی قونسولیەتی ئینگلیــز ( نەمرود رەسام )(۱٤) داویەتی ، خۆی داوە بە دەستەوە ، ئیتر ئەگیرێ و ئەنێررێ بۆ ئەستەموول و بەم شــێوەیــە بزووتنەوەکەی کوژێنرایەوە ، ئەوەی ، ئــەوەی شایانی باسە ، ئەوەیە کە فەرمانڕەوایەتی عوســمانی میدالیەی تایبەتی بەخشیوە بە هەموو ئەو ئەفسەرو سەربازانەی کە لە کوژانەوەی ئەم بزوتنەوەیەدا هاوبەشــیان کردبوو ، بەڵام یەزدان شیر خۆی لە دواییدا بووبــە پالەوانێکی نەتەوایەتی و کۆمەڵێك شیعری میللی کوردەواری یادیان کردۆتەوە . سۆتسین(۱٥) ، گەلێ گۆرانی تۆمار کردووە کە بەم پاڵەوانەدا وتراوون .

---

(۱٤) ئەم کابرایە خەڵکی ناوچەکە بووە ، گەلێ شوێنەواری ئەرکیۆلۆجی لە وڵاتی ئاشوردا دۆزیبوەوە ، ( سەیری تۆراییف ، مێژووی رۆژهەڵاتی کۆن ، ۱۹۱۳ ، بەندی یەکەم ، لاپەڕە ، ۳۷ ، بەزمانی رووسی بکە ) .

(۱٥) سوتسین لەگەڵ پریم دا کۆمەڵێ گۆرانی فۆلکلۆری کوردیان کۆکردۆتــەوە و لەگەڵ وەرگێــڕراوە فەرەنسی یەکەیداو لە چوار بەرگدا لە ساڵانی ۱۸۸۷و ۱۸۹۰دا لە پیترسبورك چاپیان کردووە ـ مارف ـ .

هێشتا جەنگی ۱۸۷۷ ـ ۱۸۷۸ تەواو نەبوو بوو کە بزوتنەوەیەکی تر لە هەکاریو بادینان ( ئامێدی )و بۆتان‌دا درووست بوو ، ئەوانەی دروستیان کرد هەر ئەندامانی ئەو هۆزە خۆیانو بەتایبەتی نەوەکانی بەدرخان بوون ، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە یەکێکیان لە سەرکردایەتی گشتی سوپای عوسمانیدا عەقید بووە . بە دەست هێنانی سەربەخۆیی یەکێك بووە لە ئامانجەکانی ئەو بزووتنەوەیە، ئەم هەوڵەش هەمدیسان لـــە سەرەت‌دا دەستی بەسەردا گیراوەو سەرکردەکانی بزوتنەوەکە گیراوون ، بـــەم شێوەیە ئەو هەوڵە لاوازەش کوژێنراوەتەوە .

بەڵام بزوتنەوەی ســالی ۱۸۸۰ (۱٦) جیاوازە لـــە بزوتنەوەکانی تر ، سەرکردەکەی شێخ عوبەیدوڵلا بووە کە لە کوردستاندا شوێنێکی ئەدەبی باشی هەیە ، هـەر ئەو بووە کە لە شەڕی ساڵی ۱۸۷۸دا یارمەتی تورکەکانی داوە ، ئامانجی لـــەم بزوتنەوەیەش بەدەســـت هێنانی سەربەخۆیی کوردستان بووە ، شێخ عوبەیدوڵلا لە خاکی ئێرانەوە دەستی بە بزوتنەوەکەی کردووە .

هێزی کوردەکان لە دەوروبەری ورمێ‌دا کۆبوونەوەو

---

(۱٦) هاوڵاتی کوردی سۆڤیەت جەلیل جاســم جەلیل ( بزوتنەوەی کوردەکانی لە ساڵی ۱۸۸۰ )دا کردووە بەبابەتی نامەی دکتۆراکەی کە لە مێژوودا هێناویەتیو لە ساڵی ۱۹٦٦ دا لە مۆسکۆ بـــە زمانی رووســـی چاپـــکراوە ـ مارف ـ .

دەریاچەی ورمێ لەژێر دەستی ئەماندا بووە . ( بێناب ) یان داگیر کردووە و بەرەو تەوریزیش رۆیشتوون بەڕادەیەك لە شەقامەکاندا سەنگەریان دامەزراندوەو شەڕوو کوشتاری توندیان تیـــا کردووە . قونسولیەتی ئێمە خۆی ئامـــادە کردبوو ، بۆ وەرگرتنی ئەرشیف ، بەڵام ئەوەندەی نەبرد کە هـــۆزەکانی ماکـــۆ بەنیازی رزگار کردنی ورمی کەوتنەڕێ و لە سەر سنووری ئێمەش تیپێکی تایبەتی لە خەڵکی نەخچەوان بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ ئەلخازووف بۆ چاودێری رێکخراو ، فارسەکان بەرگرییەکی توندیان کرد ، بە شێوەیەکی تایبەتی لە دەووروروبەری مەراغەدا ، تا لە دووایدا کوردەکانیان ناچار کردووە کە بگەڕێنە دوواوەو پاشەکشێ بکەن ، لە سەرەتادا تالآن و برۆ لە سیفاتی بزوتنەوەکە بووە ـ من بەش بەحـــاڵی خۆم ـ بیستم کە کوردەکان گەڕاونەتەوە بۆ شوێنەکانی خۆیانو ئیتر لە توانایاندا نەبووە کە بزوتنەوەیەکی تر پێك بهێنن . ( گ‌ك . ئەراکلیان ) لـــەوکاتەدا وەك پەیامنێرێکی تایبەتی رۆژنامەی ( دەنگ ) چوەتـــە ناوچەکەو لەم دوواییـــەدا نووسیوویەتی(١٧) .

ئەرمەنیەکان لـــە بزوتنەوەکەی عوبەیدوڵلادا زیانیان

---

(١٧) دەنگو باسی بەشی قەفقاسی کۆمەڵەی جوگرافیای ئیمپراتۆرییەتی رووسی ، ژمارە ، ٤ ، ١٧ ، ١٩ ، ( کوردەکان لەوڵاتی فارس ) دا بە زمانی رووسی، وتارەکە بریتییە لە تێبینی سەرپێیی .

نەکرد ، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە فارسەکان کوژران و زیانی ماڵیشیان هەر زۆر بووە ، فەرمانڕەوایەتی فارسی نارەزاییەکی توندی دەربڕیووە ، بەڵام شێخ عوبەیدوڵلا نێرراوە بۆ ئەستەموول و لەوێـــوە لە ڕێگای قەفقاسەوە ڕای کردووە بـــۆ ئازربایجان ، بەڵام بـۆ جاری دووەم گرتیان و دووریان خستەوە بۆ مەککە .

بەڵام شـــێخ عەبدولقادری کوڕی دووای شـــۆڕش گەڕاوەتەوە بـــۆ تورکیا و ئێستا ئەندامی ئەنجـومـەنی سیناتی ( پیرانی ) تورکیایە(١٨) .

لـــە نەوەدەکانی سەدەی رابووردوودا تورکەکان هەوڵیانداوە کوردەکان بەکار بهێنن بۆ ئەوەی غەدر لە ئەرمەنیە دراوسێکانیا بکەن ، بەڵام ئەو هەڵوێستە جوانەی کە شێخ عوبەیدوڵلا لێی وەســـتا لاپەڕەیەکی رووناکە لە مێژوودا ، هەندێ لە دۆستەکانی شێخ وایان بۆ پێشنیار کرد کە قەسابخانە لە دژی گاورەکان دابنێن ، بەڵام

---

(١٨) زانیارییەکی مێژوویی زۆر دەربارەی مێژووی تازەی کوردەکان هەیە کە نووسەرە جـەنگیەکانی رووس کۆیان کردۆتەوە، کارتسۆف،ئەڤیریانۆف ، کاسارۆڤ، من کەڵکم لەم زانیارییانـــە وەرگرتووە و بابـەتم لێوەرگرتوون ، هەروەها کەڵکم لە کتێبی شـــینی ئینگلیـــزی ( زانیاری تایبەتی دەربارەی هێرشـــی کوردەکان لە دژی ئێران و تورکیا ، ساڵی ١٨٨١ ، ژمارە ، ٥ ، بە زمانی ئینگلیزی ) ، وەرگرتووە .

شێخ وتی :- ( ئێمەی کورد ؛ تورکەکان ئێستا پێویستیان پێمانە بۆ نەهێشتنی گاورەکان ، خـۆ ئەگەر گاورەکان لەناو ببەین ، ئەوا لە دووایپدا تورکەکان ئێمە لەناو دەبەن .

شاکر پاشــای بەناوبانگ کە لـە ســاڵی ۱۸۹۱ دا سەرکردەی گشتی ئیصلاحاتی بوو ، لــە ویلایەتەکانی ئەنەدۆڵدا هەوڵی ئەوەی داوە کە لە کوردەکان سوپایەکی نیزامی دابمەزرێنێ کە لە قۆزاق(×) بکات ، بەڕاستی لە ساڵی ۱۸۹۲دا لە ئەستەموول و بەغداد ( قوتابجانەی عەشایەری ) دامەزراوەو گیانی تورکایەتی لە بیروهۆشی نەوەی هۆزە عەرەبو کوردە کۆچەرەکاندا درووست کردووەو نزیکی کردوونەتەوە لــە توورکیا ، لەگـەڵ ئەوەشدا کە ئـەم قوتابخانانــە کرایەوە ، هەر زۆری نەخایاندوە . دووای ئەوە تەواو کردنو جێ بەجێ کردنی ئەم ئیصلاحاتە کە شاکر پاشا پێشنیاری کردبوو درا بــە زەکی پاشاو ئەویش پێی قایل بوو ، چونکە ئەم ئەیویست بۆ ئامانجی سەربازی بەکاری بهێنێو وای ئەزانی ئەتوانێ لــە ماوەیەکی کورتداو بــە پارەیەکی کەم هێزێکی

---

(×) د . مارف لە پەراوێزی ژمارە (٢٤)ی بەشی پێنجەمی ئـەم کتێبەدا باســی ( قۆزاق )ی کردووەو ئەڵــێ ( قازاقەکان بە نەتەوەیەکی تایبەتی دائەنرێن و بە رووسی قسە ئەکەن ، وە لەسەر رووباری ( گۆوبان ) ئەژین کە ئەڕژێتە دەریای ڕەشەوەو هەندێکیش بە نەتەوەیەکی رووسییان دائەنێن .

چەکدار پێك بهێنێ. لە راستیدا ئەم رێکخراوە سەربازی‌یەی کە دروست کرا ناونرا (حەمیدی)(١٩) یە، بێ‌گومان لە رووی سەربازی‌یەوە سەرکەووت، لەبەر ئەوە تورکەکان بڕیاریاندا بیکەن بە سوپایەکی رێکخراوی سوارە (سوکە سواری).

سوڵتان عەبدولحەمید هەوڵی داوە کوردەکان و ئەلبانیەکانیش بەکار بهێنێ بۆ ئامانجی تایبەتی خۆی، وە بەشێوەیەك بیری ئەکردەوە کە گوایە ئەمانە بۆ یاسایەکی مەدەنی نەبێت سەر دانانەوێنن.

بەڵام مەسەلەکە هەر چۆن بێت حالی کوردەکان لە دووای بڵاوکردنەوەی دەستوور ئیتر لە خراپەوە بەرەو خراپتر ئەچوو، ئەوەی زانراوبێت ئەوەیە کە بزوتنەوەی تازە پێگەیشتووی تورکیا زۆر بەخێرایی هەڵگەڕایەوە بۆ شۆڤێنیەتی پیسی تورکی و هەولی ئەوەی ئەدا بە زۆر و لە ژێر دروشمی دامەزراندنی (نیشتمانی عوسمانی گشتی‌دا) سیاسەتی بەتورك کردن بەسەر خەڵکەکەدا بسەپێنێ، ئەم بزوتنەوەیە هەوڵی‌دا دەسەڵاتی خزمایەتی ناو فەرمانڕەواکان کە پشتاو پشت فەرمانڕەوایەتیان ئەگرتە دەست بڵاو لاواز

(١٩) دەربارەی (حەمیدی) یە سەرچاوەیەکی جەنگی زۆر هەیە، بۆ نموونە سەیری ف. ف. گریازۆف. (کوردەکان و سواری کورد) بکە، دەنگوباسی بارەگای سەرکردایەتی جەنگ لە قەفقاس، تشرینی یەکەمی ١٩٠٧، لاپەڕە، ٢٠، بە زمانی رووسی.

بکات ، ئەنجام شتێکی سەیر بوو، دەسەڵات ، فەرمانبەرانی ئەو لێژنانە وەریانگرت کە زمانو خوو ڕەوشتی ناوخۆیان نە ئەزانی ، لە کاروباری فەرمانڕەوایەتیان نە ئەزانی ، بەڵکو لە ئاهەنگو بەزمو ڕەزمی جەژنە نەتەوایەتیەکانداو لە وتاری ناسك خوێندنەوەدا زۆر شارەزا بوون . . . . . هەروەها لە کۆبوونەوەي سەرکەشتیو ئەستۆڵەکانیشدا هەر شارەزا بوون . . . . هتد ، ئــەم هەموو هــتانەیان بەکەڵکی کوردەکان نەهاتن .

بێگومان ئەم وتارەی کە دەربارەی کوردەکانە ، تەواو نابێ ئەگەر ناوی ئــەو کەسانە نەبەین کە ڕۆشنبیرانی کورد هەمیشــە شانازی‌یان پێــوە ئەکەن ، سەلاحەددین یەکەم کوردێکی مەزن بووە کە لە سەرانسەری جیهاندا ناسراوە ، ئەم پیاوە دامەزرێنەری خێزانی ئەیوبی‌یە کە لە ساڵی ١١٦٩ی زاینی‌یەوە تاکۆتایی سەدەی سیانزەهەم فەرمانڕەوایەتی میسرو سوریاو وڵاتی نێوان دووڕووباری ( وڵاتی مێزو بۆتامیا ) یان کردووە . هەر ئەمیش بووە کە قەیسەری گاورەکانی لە قودسدا رووخـانــدووە ، بەرانبەرکێ کەری سەرکەوتووی ( ریچارد )ی یەکەمی ئینگلیزو ( فلیب ئاغستۆسی ) فەرەنسی بووە .

خێزانی زەندی‌یەکان کە کەریم خانی زەند لە وڵاتی فارسدا لە ساڵی ١٧٥٠ تــا ١٧٧٥ دایمەزرانــدوە ،

فەرمانڕەوایەتیان کردووە(٢٠) . بەلاّم لە خێزانە سەربەخۆکانی نیشتمانی کوردا ، ئەتوانرێ باسی ( مەڕوانی‌یەکان لە ساڵی ٩٩٠ تا ١٠٩٦ ) بکرێت ، ئەوانەی باسمان کردنو هەروەها ( حەسنەوی‌یەکان ) لە بەشی خوارووی رۆژهەلاّتی کوردستاندا ( لە ساڵی ٩٥٩ تا ساڵی ١٠١٥ ) لە دینەوەرو شارەزووردا ئەمارەتیان هەبوو ، ئەردەلاّن ، سلێمانی ، بادینان ، رەواندز ، هەکاری ، شەمدینان ، بۆتان ، بایەزید(٢١) ، . . . . هتد ، وە بەشێکیان تا ئەمڕۆی ئێمەش هەر بەردەوام بوون ، زۆر لە فەرمانڕەوا هۆزی‌یەکانی ئەم سەردەمەش هەمان دەسەلاّتیان هەیە ، کە کاتێ خۆی ئەو ئەمارەتانەی باسمان کردن بوویانە ، یاخود بەمانایەکی تر ، ئەمانە سەربەخۆ بوون .

---

(٢٠) بەم بۆنەیەوە ئەبێ باسی کوردە شەددادی‌یەکان بکەین ( سەدەی دەهەم تا سەدەی دووانزەهەم ) ئەوانەی فەرمانڕەوایەتی بەشەکانی خوارووی دوواوەی قەفقاسیان کردووەو دوو مزگەوتیان دروست کردووە ( ما . دانراوەکان ، ١٢٣ ) هەروەها سەیری ( پول ، خێزانە موسوڵمانەکانو بارتولد ، لاپەڕە ، ١٩٥ ، بکە ) .

(٢١) کاتێ ئێمە بایەزیدمان داگیر کرد ، باڵول پاشامان گرت ، کە دووا ئەمیری کورد بوو ، هێنامان بۆ بەتلیس ، بەلاّم رای کردوو لە تورکیادا دەسەلاّتەکەی پێدرایەوە ، بەلاّم لە ساڵی ١٨٥٥ دا بۆ جاری دووەم گرتمانەوە .

له بەشی خواررووی دیاربەکردا له ( شارویران ) له سەرەتای ئەم سەردەمەی ئێمەدا سەرەك هۆزێکی میللی بەناوی ئیبراهیم پاشاوە دەسەلاتی ئەمیری تورکی هەبووە. تەنانەت هەندێ له هۆزە عەرەبەکانیشی خستبووە ژێـــر دەستی خۆیەوە ، باجی نەئەداو دەستی بەسەر وەزعەکەدا گـــرتبـــوو(٢٢) .

ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی کورتی کوردو کوردستان بوو، بەلام هــۆی گشلی نەبوونی یەکیەتی لــە ناویانــدا و جیاوازی جوگرافیایان ، له چەمو دۆلی زۆروو ، زنجیرە چیای سەختو ئاوی خوڕو بەهێز ، بوونەتە هۆی بەش کردنی ژیانی سیاسیانو دروســت بــوونی حالــەتی دەرەبەگایەتی ، بەلام سەرەڕای ئەمە هەستی سەربەستیو سەربەخۆییان زۆر بەهێزەو ، هەر ئەمەشە کە یەکێکە له کۆلەکەکانی بوونی کــورد ، هەروەها لــە مێژووی بزوتنەوەکانی کوردیشا دیارە ، هەروەها ئەبێ ئەوەمان له بیر نەچێ کە کوردەکان لەو شوێنانەدا کە تیا ژیاوون ، بەگشتی کاریان کردۆتە سەر رۆشنبیری کۆن، نووسینەکەی مار ، کە دەستمان بۆ راکێشا ، ناونیشانێکی جوانی هەیە کە ئەلێ : ـ ( دەربارەی تێگەیشتنی رۆشنبیری گەلی کورد

---

(٢٢) لالایان ، ئاسوری‌یەکان ، له ویــلایەتی واندا ، نووسینەکانی بەشی ، قەفقاس له کۆمەڵەی جوگرافی ئیمپراتۆری‌یەتی رووسی ، ژمارە ، ٢٨ ، بلاوکراوەی چوارەم ، ساڵی ١٩١٤ .

له رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ) دا .

بێگومان هەندێ بیروڕای ئاینی کە کۆمەڵگای کوردی بەستۆتەوە تێکەڵاوی بیرو باوەڕی ئاینی گاورو ئیسلام بووە(٢٣) . زمانی کوردیش کارێکی یەکجــار زۆری کردۆتە ســەر گەلە دراوسێکانیی و تاکو ئێستاش هــەر ئەیکات ، وەکو ئەبینین لــە هەندێ ناوچەی ویلایەتی ەتلیس دا . ئەرمەنیەکان زمانەکەی خۆیانیان لەبیرچۆتەوەو تەنها بە کوردی قسە ئەکەن(٢٤) ، هەروەها ئاسوری یە شاخاویەکان ( رەوشتێکی گشتیان هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە گۆرانی کوردی ئەڵێن و سەرگورووشتە میللیە کوردی یەکان ئــەگێڕنــەوە )(٢٥) .

---

(٢٣) بڕوابەوەی کە رۆح ئەمرێ و ئیتر جارێکی تر بەهیچ جۆرێ زیندو نابێتەوە وەکو خۆی ، ( ئەمـە لەگەڵ یەزیدی یەکاندا بەرانبەر بکە ) .

(٢٤) ئەمە ئەوەیـە کە مایێڤسکی و بیلك و خەڵکانی تریش ئــەیڵێــن .

(٢٥) لالایان ، ئاسوری یەکان لــە ویــلایەتی واندا ، نووسینەکانی بەشی قەفقاس لە کۆمەڵەی جوگرافی ئیمپراتۆری یەتی رووسی ، ژمارە ، ٢٨ ، بلاوکراوەی چوارەم ، ساڵی ١٩١٤ .

## ژیانی رۆژانه ، چینه کانی کۆمەڵایەتی ، شەخسیەتی کورد .

لای هەموان ڕوونە ، کە کوردەکان بەش کراون بە هۆزی کۆچەرو شارستانیو تێکەڵاو لەگەڵ یەکتریدا ئەژین ، هۆزە کۆچەرەکان بە زۆری لە سەرووداو لە نێوان وڵاتی ( میزو پۆتامیا ) دا ئەژین(١) شێوەی ژیانیان زۆر

(١) ئەوەی پەیوەندی بە سەرژماردنی کوردەکان و خێزانەکانیانەوە هەبێت ، زانیاری گرنگ هەیە ، ( سەیری وتارەکەی سایکس بکە ) ، هەروەها دەنگو باسی رائید (تروتیر) . لەم ڕووەوە سەیری ( وەرگێڕاوی کوردەکانی ئاسیای بچوك ، دەنگو باسی بەشی قەفقاسی کۆمەڵەی جوگرافی ئیمپراتۆریەتی روسی ، ٧ ، ساڵی ١٨٨٢ : لاپەڕە ، ١ - ٤ ، بکە ) . هەروەها کارە گەورە چاکەکەی لیرخ . ( لێکۆڵینەوە دەربارەی کوردە ئێرانیەکانو پەیوەندییان بە خالیدییەکانی سەرچاوەی دووایی ) ، بەڵام زانیارییەکانی کۆن بوون .

لە شێوەی ژیانی ئەو قەرەجانە(×) ئەکا کە لەوڵاتی ئێمەدان، ئەوەی شایانی باسە ژیانی ژمارەیەکی زۆر لەم هۆزانە بوونەتە نیوە شارستانی ، لە زستاندا لە دۆڵەکاندا و لە خانووی قوڕوکادا ئەژین ، لە بەهاریشدا لە کێڵگەکاندا ئەژین و هەندێ لە ئەندامانی هۆزەکانیان ئەکەنە پاسەوانی خۆیان ، لەگەڵ ڕانەکانیاندا ئەچنە سەر چیاکان و دەواری هاوینە هەڵ ئەدەن ، ( کە لە دەووروبەری سلێمانیدا پێی ئەڵێن هەوار ). زۆر جاریش لە زستانە هەوارەکاندا ئەژین.

ئەو ئەرمەنانەی لە کۆندا لە موش دائەنیشتن لە حاڵەتێکی ناخۆشدا ئەژیان و ترس دای ئەگرتن ، بەشێوەیەکی تایبەتی لەو شوێنانەدا کەنزیکی رێڕەوی هۆزە کۆچەری یەکان بوو ، بەڵام لەم کاتەی ئێستادا مەسەلەکە بە پێچەوانەوەیە ، هەروەکو ( لینج )ی پسپۆڕو شارەزا

---

(×) رەنگە لێرەدا نووسەر مەبەستی لە شێوە ژیانی کۆچەرایەتی بێت ، چونکە کاتی خۆی بەشی زۆری هۆزە کوردەکان کۆچەر بوونو قەرەجیش لە هەرچی شوێنێك بێت کۆچەرن ، ئەگینا لەلابەن ژیانی کۆمەڵایەتیو خووڕەوشتو ئایینو مێژووەوە ، کورد شێوە ژیانێکی تایبەتی خۆی هەیەو هەر نووسەر خۆی لەم بەشەی ئەم کتێبەدا دانی پیاناوە ، قەرەجیش شێوە ژیانێکی کۆمەڵایەتیو خوو ڕەوشتو ئاینی تایبەتی خۆیانیان هەیەو زۆر جیاوازن لەگەل شێوە ژیانی نەتەوەی کورداو بۆ زیاتر شارەزابوون لەم مەسەلەیە سەیری کتێبی (الغجر)ی جان بول کلیبیر بکە.

له کاروباری ئەرمەنستاندا شایەتی لەسەر ئەدات و ئەڵێ ( هۆزە کوردە کۆچەرییەکان لەسەر زنجیرە چیاکانی ئەرمەنستان دێهاتی خۆیانیان هەبووە )(٢) . لەمەوە دەرئەکەوێ کە کوردەکان لەناوچە ئەرمەنیەکاندا ژمارەیان زۆر بووە ، تەنانەت لە شوێنی وەکو موشیشدا کە بە ناوچەیەکی سەرەکی ئەرمەنیەکان دائەنرێت . هۆزە گەورەکانی ئەم ناوچەیە هەر ئەو خوو رەووشتە گشتیەیان هەیە کە هۆزە دوورەکان هەیانە ، وەکو هۆزی جاف لە شارەزوور ، ( رەگەزی ئەم هۆزە لە ئێراندایە ) ، هەروەها لە کۆچ و رەوەنی هۆزەکاندا خوو رەوشتی سەیر سەیر هەیە ، بەرۆژا کۆچ ئەکەن و لە شەویشدا لە شوێنی دیاری کراودا ئەخەوون و بارو بارخانەیان لەسەر بەرزایی چیاکاندا ئەخەن .

له هەندێ شوێندا ژمارەیەك لە هۆزە کوردەکان بوونە ( دژی نەتەوەی کورد ) - ئەگەر بشێ وابڵێین ، ئەم رووداڵەتەیش زۆر جار لە شوێنە دوورەکاندایان لەسەر سنووری نەتەوەیی گەلی کوردا بەدی ئەکرێت ، بەلاّم لە رووی باری کۆمەڵایەتی بەوە بەشێوەیەکی گشتی کوردەکان ، لە عەشرەت عەشرەت ، پێك هاتوون .

---

(٢) هـ.ف.ب. لینج ، ئەرمەنستان ، سەردان و لێکۆڵینەوە ، ساڵی ١٩٠١ ، بەرگی دووەم ، لاپەڕە ، ٤٢٣ ، بەزمانی ئینگلیزی و جۆنکۆ ڤسکی لەساڵی ١٩١٠دا کردوویەتی بە رووسی .

عەشرەت لە دوو بەش پێك هاتووە ، بەشی یەکەمیان جەنگاوەرەکان ، ئەمانە سەرۆکەکانن ، ( ئاغا )و هەروەها خاوەن زەوی‌و دەست‌و پێرەندەکانیان ، بەشی دووەمیان جووتیارەکان ( الرعیە ) ، واتە مسکێنەکان ، ئەمانە ئەوانەن کە نیمچــە کۆیلەی زەوین ، بــەڵام بە شــێوەیەکی مام ناوەندی(٣) ، بەڵام هەستی پەیوەندی خێزانی بــە تایبەتی پەیوەندی بە ئاغاوە ، ئەوە هەستێکی شانازی‌یە بە خزمایەتیەوە ، بەرادەیەك بووەتە بەشێك لە ژیانیان(٤) .

---

(٣) ئەوەی دوواییی زۆرجار پــێی ئەوترێ ( گۆران ) لەسەر ئــەم مەسەلەیە ، ئەم وشە دوو مانای هەیە ، یەکەمیان جووتیار یاخوود وەرزێر ، دووەمیشیان ناوی هۆزێکە لە بەشی رۆژهەڵاتی زەهاودا ئەژین ، رۆلنسۆن وا ئەزانێ کە رەگەزی هــۆزی گۆران لە هۆزی کەلوڕە ، وەسوڵتان مرادی چوارەم باجەلانیەکانی لە دیار بەکرەوە هێناوەو لە دەوروبەری ســاڵی ١٦٣٩ دا لــە رۆژئاوای زەهــاودا کەلــوڕەکانی دەرکردووە ، وە ئــەو جیاوازی‌یانەی لــە نێوان شێوەزمانی گۆران‌و کەلوڕدا هەیە دژی ئەم رایەیەو ( لە داهاتووشدا سەیری ئەم مەسەلەیە بکە ) .

(٤) تورکەکان هەوڵیاندا جوتیارەکان (مسکێنەکان) رێك بخەن ، لە رۆژانی داگیرکردنی ناوچەکانی سنووری فارسی‌دا ، من بەش بەحــاڵی خــۆم زۆرجار لــە جووتیارەکانم بیستووە کە بە پەستی‌یەوە ، وتوویانە ( ئیتر ئاغامان نی‌یە ) چونکە تورکەکان هەوڵیاندا کە دەسەڵاتی ئاغا نەیەلن .

جووتیاری کورد و ئیشی رۆژانه

له زۆر شوێن‌دا وا سه‌یری ئاغا ئه‌کرێ که ئه‌و داگیرکه‌ری سه‌رکه‌وتووه‌و مسکێنه‌که‌ش له جنسێکی ترن ، بۆ راستیش ئه‌بێ بووترێ که شه‌خسیه‌تی ئاغا خانه‌دانی‌و سه‌خاوه‌تی تیایه ، به‌راده‌یه‌ك هه‌ر لـه یه‌که‌م بینین‌دا ئه‌توانین لـه جوتیاره‌کانی جیا بکه‌ینه‌وه(×) . وه توانایه‌کی فراوانی له ده‌سه‌لات‌و داگیرکردندا هه‌یه ، له پێناوی سه‌لماندنی راستی ئه‌م رایه له رووی مێژووه‌وه ئه‌ڵێن ، باو باپیری هۆزی شکاك توانیان ده‌ست به‌سه‌ر ئه‌و دانیشتووه کۆنانه‌دا بگرن که له‌ناوچه‌کانی کوتوور و سـوومار و شوێنه‌کانی تـردا ئـه‌ژیـان .

به شێوه‌یه‌کی گشتی شه‌خسیه‌تی کورد جۆراو جۆره ، به‌راده‌یه‌ك زۆر نارِه‌حه‌ته که متمانه بکه‌ینه سه‌ر سیفاتی

---

(×) ئه‌م رایه‌ی مینۆرسکی زیاتر ئـه‌و ئه‌سه‌لمێنێ که لـه زۆر ده‌مه‌وه جووتیاری کورد هه‌ر ره‌ش‌و رووت بووه‌و ئاغاش هه‌ر ئاغاو پۆشته‌و په‌رداخ ، دیـاره هه‌موو کاتێ که ئاغاو جووتیار ئه‌بینرێن زۆر به‌ئاسانی لێك جیا ئه‌کرێنه‌وه ، ئه‌مه‌ش نه‌ك به‌لێهاتن‌و ئازایه‌تی‌و ئه‌سڵ‌و نه‌سه‌ب ، به‌ڵکو به جل‌و به‌رگ‌و سمێڵی زل‌و مشکی‌و مێزه‌ری گه‌وره ، ته‌نانه‌ت له‌م سه‌رده‌مه‌ی ئه‌مرِۆشدا ، ره‌نگه بتووانرێ هه‌ر له رواڵه‌تی ده‌ره‌وه‌و جل‌و به‌رگ‌و هه‌ڵسو که‌وتی رۆژانه‌دا چینه‌کانی کۆمه‌ڵ جیا بکرێنه‌وه ، ئیتر چی جای سـه‌رده‌می هاتنـی نووسه‌ر بۆ کوردستان .

(ئەنتروبۆلۆجیان )(٥) ، لەبـەر ئەوە لەوانەیە لەنـاو کوردەکاندا دەمووچاوی خڕی ئەرمەنیانەو سامی عەربیانە بەدی بکرێت(٦) ، یاخود بە زۆری نەستووری گاورانە.

بەڵام کوردەکان لە ناچەی سلێمانیدا بە شێوەیەکی گشتی شەخسیەتی ئێرانی خۆیانیان پاراستووە(×) ، چونکە

---

(٥) دەربـارەی ئەنتۆگرافیاو ئەنترۆبۆلۆجیای کـورد ، زانیاری زۆر کەم هەیە ، (سەیری ، آ ، آ ئیڤانۆفسکی ـ یەزیدییەکان ـ گۆڤاری ئەنتروبۆلۆجی رووسی ، ساڵی ١٩٠٠ ژمارە ، ٣ ، بەزمانی رووسی بکە .

(٦) هەندێ عەشیرەتی کورد هەن ، بەتایبەتی لە خێزانە فەرمانڕەواکان ، بڕوایان وایە کە کراوون بە کورد و رەگەزیان عەرەبە ـ تێبینی ـ راستە ئەم شتە هەیەو زۆرجار ئەم خێزانانە ئەڵێن ئێمە نەوەی پێغەمبەرین ، من وا ئەزانم هۆی ئەم بڕواو داوایە ئەوەیە هەستی رێزگرتن لە ناخی جووتیارە موسڵمانەکانی کوردا دروست بکەن ، ئەوانەی کە تاکو ئێستاش بەچاوێکی پیرۆزییەوە سەیری پێغەمبەر ( « محمد » د . خ ) و خێزانو بنەماڵەکەیان ئەکەن . لە دواویشـدا ئـەو خێزانانە ئەم رێزەیان بەکار هێناوە بـۆ چەسپاندنی دەسەلاتیان ـ مارف ـ .

(×) لێرەدا نووسەر بە هەڵەدا چووە ، چـونکە کوردی ناوچەی سلێمانی بەتایبەتیو کوردستانی عێراق بەگشتی هەر لە کۆنەوە شەخسیەتێکی تایبەتی خۆیانیان هەیەو هیچ پەیوەندییەکیان بە شەخسیەتی ئێرانییەوە نیەو بەڵکو زۆریش جیاوازن .

ئەمانە دوور لە گەلانی ترەوە ژیاوون ، نووسەری ئەرمەنی (ئابوڤیان) بەم شێوەیە باسی شەخسیەتی کورد ئەکات ( ئەتوانی لە یەکەم بینین‌دا کورد بە پیاوەتی‌و قەدوو بالای بەهەیبەت‌و هەر لەوکاتەشدا ترسناکەوە بناسیتەوە، سەرەڕای ئەمە دەمووچاوی گەورەی بریقەدار (ئاگرین)ی تیایە . برۆکانی پڕەو ناوچەوانی بەرزەو لوتی درێژوو چەماوەیەو هەنگاوەکانی قورس و بەهێزن ، یاخود بە بەمانایەکی تر رەوشت‌و سیفاتی پاڵەوانە کۆنەکان) .

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە ، ئەو کوردانەی لە بەشەکانی رۆژئاوای ئێران‌و لوڕدا ئەژین ، تاکو ئێستاش هۆزی کۆچەریـن ، کە لەگەلانی هینـدۆ ـ ئەورووپاییـدا ماونەتەوە(٧) .

---

(٧) گومان لـە ئێرانیەتی ئەو کوردانەدا نی‌یە(×) ، ئەوەندەی مەسەلەکە پەیوەندی بەزمانی کوردی‌یەوە هەبێت ، بەڵام حوکم‌دان بەسەرکاری گەلانی تر لەسەر کورد ، ئەوە تاکو ئێستا هیچ توانایەکی بۆنی‌یە، بـەڵام دەربـارەی شـەخسیەتی کوردو ژیانـی کۆمـەڵایەتیان‌و مێژوو و دەوری رۆشنبیری‌یان لەناو گەلانی تری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ، زانیاری و دەنگو باسی زۆر لە وتارەکەی ئاکادیمی ماردا هەیە،

---

←

( جارێکی تر دەربارەی وشەی چەلەبی )، نووسینەکانی بەشی رۆژهەلاتی کۆمەڵەی ئەکیۆلۆجی - بەرگی ٢٠ ، سالی ١٩١٠ ، ئەمە کارێکی چاکەو زانیاری گرنگی تیایە - تێبینی - ئەگەر خۆماندا بەدەست ئەوەوە کە توخمی غەریب ( لە خوێن )دا لەناو گەلی کوردا هەیە ، ئەوا ئەم رواڵەتە کار ناکاتە سەر بوونی کورد وەك نەتەوەیەك ، چونکە تیوریە کۆمەلایەتیەکان ، ئەوەیان داوەتە دوواوە کە ( پەیوەندی خوێن ) لە کۆڵەکەکانی پێك هێنانی نەتەوەدا بێت - مارف - .

(×) کورد هەمووی ئێرانی نی یە ، تەنها ئەو کوردانە ئێرانین کە لە کوردستانی ئێراندا دائەنیشن و زمانی کوردیش بەگوێرەی ناوچەکانی کوردستان شێوەی ئەگۆرێ .

## زمـان - ئـەدەب - نووسـین .

زمانی کوردی لـە بنەماڵەی زمانی ئاری‌یە . وەکو زانراوە پێك هاتووە لە زمانی ئێرانی‌و ئەفغانی‌و بلوجی‌و ئەسیتینی‌و گەلێ شێوە زمانی کۆن‌و تازەی تریش ، زمانی کوردی فارسی نی‌یەو کرابێت بە کوردی ، بەڵکو زمانێکی سەربەخۆیەو یاسای فۆنێتیك‌و سینەکسیسی تایبەتی خۆی هەیە ، پەیوەندیشی بەزمانی فارسی‌یەوە وەکو پەیوەندی سربی بەرووسی‌یەوە وایە ، یان بەشێوەیەکی وردتـر ، وەکو پەیوەندی زمانی ئاری سویسری‌یە شـاخاویەکان بەزمانی ئیتالی‌یەوە وایە . هەروەها زمانی کوردی بەستراوە بەم‌و بەوەوە ، هەروەها بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەستراوە بەزمانی ( ئاڤێسـتا ) وە ، کە کتێبی پیرۆزی ( ئاڤێسـتا ) کتێبی ئاگرپەرسـتەکانی پێ نووسـراوە ، بیرووڕایەکیش هەیە کەزمانی کوردی ، وەکو بەشی زۆری شێوە زمانە تازەکانی تـری ئێران ، بەشـی زۆری کۆڵەکەکانی دروست بوونی لە زمانی میدی کۆنەوە وەرگرتووە ....

میدیا ئەو فەرمانڕەوایەتیەیە کە فەرمانڕەوایەتی ئێـرانی کۆنی کردووە .

زمانی کوردی بەش کراوە بەشێوە زمانی زۆرەوە وەکـو :-

١ - شێوە زمانی خواروو ، لە شێوە زمانەکانی کرماشان و سەنەندج(×) و ... هتد پێك هاتووە .

٢ - شێوە زمانی رۆژهەلات :- زمانی سلێمانی و سابلاغ (×) .

٣ - شـێوە زمانی رۆژئاوایی :- ئەمەیان تاڕادەیەك لـە هەموو سەرانسەری کوردستاندا بلاوبۆتەوە(١) .

---

(×) مەبەست لە سلەی ئێستایە کە لە ئێراندا کوردستانی پێ لـەلێن .

(×) مەبەست لە مەهابادی ئێستایە .

(١) تاکو ئێستا رای پرۆفیسۆر ئۆسکارمان ، ئەوەنـدەی مەسەلەکە پەیوەندی بە شـێوە زمانـەکانی کوردی تورکیاوە بێت روون نەبۆتەوە . بەلام ڕاکانی قونسوڵ ژابا چاکیی خۆی پاراستووە - بۆ ئامانجی ئیش پێ کردن - وە ڕاکانی ژابا لە تێبینیی‌یەکانی لیرخدا هاتووە ، گۆڤاری ئاسیای پیترسبورك ، ساڵی ١٨٥٩ ، بەرگی سێ‌یەم ، لاپەڕە ، ٢٤٢ ، ٢٥٥ ، بەزمانی فارسی، وە شێوە زمانەکانی جیا کردۆتەوە بۆ ، رەوەندی ، ( ئەرزروم ، بەتلیس ، بایەزیـد ، قارس ، ورمێ ) . وە هەکاری ( بۆتـان ، دیاربەکر ، ئامێــدی ، هۆزەکانی هەرکی ) ، وە سوری ( بلباس ، سلێمانی ، موکری ، زەرزی ) وە لە دووابیدا هۆرۆمکی ( زازا ) .

کورده ڕۆژهەڵاتی‌یەکان و ڕۆژئاواییەکانیش بە
زمانەکەیان ئەڵێن ( کورمانجی ) لەسەر ئەوەشەوە ؛
کەمابەتیەکانی تر بە شێوە زمانی ڕۆژهەڵاتی ئەدوێن ،

---

تێبینی :-

ئەبوو ایە مینۆرسکی وا لە مەسەلەکە نەگەیشتایە ،
چونکە بەش کردنی شێوە زمانەکانی کوردی لەسەر
بناغەی جوگرافی شتێکی بڕواپێ‌کراو نی‌یە ، چونکە
بەو مەسەلەیە لای نەکردۆتەوە بەلای سروشتی شێوە
زمانەکان‌و پەیوەندی‌یان بەیەکتری‌یەوە ، بێگومان
باری جوگرافی کارئەکاتە سەر شێوە زمان ، بەڵام
جیای ناکاتەوە ، ئەوەشی پەیوەندی بە ژاباوە هەبێت،
ئەو لەسەر بناغەی هۆزو ئەو ناوچانەی تیا دائەنیشن
جیای کردوونەتەوە ، تەنانەت ئەو ناوچە جوگرافی-
یەکان‌و شارەکانی بەستووە بەو هۆزانەوە کە تیا
دائەنیشن ، ئەمەش شتێکە دوورە لە ڕاستی‌یەوە .
کوردەکان خۆیان لێکۆلینەوەی زۆریان کردووەو
خشتەی تایبەتیان ڕێکخستووە بۆ جیاکردنەوەی شێوە
زمانەکانی کوردی‌و ئەو ناوچانەی تیا بڵاوبوونەتەوە.
خاوەنی شەرەف نامە لە ڕووی شێوە زمانەکانەوە ،
زمانی گەلی کوردی کردووە بە چوار شێوە زمانی
گەورەوە کە ئەمانەن :- کرمانجی ، لوڕی ، گۆرانی ،

بەلاّم لــە رووی قســە پیّ کردن و فۆنێتیکەوە پاکیان پاراستووە(٢) . وە لە نیشانەکانی جیاوازی شێوە زمانی رۆژئاوایی‌و رۆژهەلاّتیدا ئاوەلناوی تاکی قسەکەرە وەکو

---

→ زازا ، هەروەها زانای کورد تۆفیق وەهبی ، ئــەم خشتەیەی فراوان کردووە ، هەر شێوە زمانێك لــەو شــێوە زمانانەی بەش کودووە بــۆ شــێوە زمانی بچوك ترو ئەو ناوچانەشی دیاری کردووە کە قسەی پیّ ئەکەن ، بۆ نموونە شێوە زمانی کرمانجی ژووروو کردووە بە دوو بەشەوە ، سەروو خواروو ، وە هەر بۆ نموونەش ئەلّێین شێوە زمانی کرمانجی خواروو لای تۆفیق وەهبی لەم ناوچانەدا بلاّوبۆتەوە ، ( هەولێر ، سلێمانی ، مەهاباد ، ســنە ) ، لە کاتێکــدا ئەبینین مینۆرسکی شێوە زمانی سلێمانی‌و سابلاّغی کردووە بە رۆژهەلاّتی‌و شێوە زمانی سنەی خستوۆتە خواروو ، لە راستیشدا خۆی لــە شێوە زمانەکانی سلێمانی‌و سابلاّغە ، ـ بەلاّم ژابــا شــێوە زمانی هۆزەکانی بلّباس‌و زەرزی ئەخاتــە نــاو شێوەکانی سلێمانی‌و سابلاّغەوە ( موکری ) لە کاتێکدا ئەم دوو شێوە زمانــە لە شێوە زمانی کرمانجی ژووروون ـ مارف ـ .

(٢) ئەتوانریّ شێوە زمانی موکری ( سابلاّغ ) بە شــێوە کلاسیکی زمانی کوردی دابنرێت ، وە ئۆسکارمان بە شێوەیەکی دووروو درێژ لیّ‌ی کۆلیوەتەوە

( من نازانم ) له شێوه زمانی ڕۆژهه‌ڵاتیدا ئه‌بێته ( نازانم ) ، له شێوه زمانی ڕۆژئاواییدا ئه‌م دوو وشه‌یه هه‌ردووکیان ئاشکران ، ته‌نانه‌ت له له‌یه‌ك چوونیشیاندا له‌گه‌ڵ سلاڤیدا ، که ئه‌مانه هه‌موویان له‌یه‌ك ڕه‌گه‌زن(٣) .

ئه‌ده‌بی میللی له ناو کورده‌کاندا زۆر ده‌وڵه‌مه‌نده ، گه‌لێ سـه‌رگوروشته‌ی خوڕه‌وشتی نه‌ته‌وایه‌تیو گه‌لێ گۆرانیو پاڵه‌وانی‌یه‌تی تیایه ، به‌تایبه‌تی پـاڵه‌وانی‌یه‌تی به‌رگری کردن له قه‌ڵای دم دم (ئه‌که‌وێته خوارووی ورمێ له نزیك ڕووباری براندۆزه‌وه ) که شا عه‌باسـی فارسی داگیری کرد. کورده‌کان به‌وپه‌ڕی خۆشه‌ویستی‌یه‌وه گۆرانی پیا ئه‌ڵێنو ڕووداوی واقعی تیایـه ، هه‌روه‌ها پاڵه‌وانیه‌تی نه‌ته‌وایه‌تی تایبه‌تی خۆیان ( مه‌مو زین ) یان هه‌یه‌و ئه‌مه‌ش له شێوه‌ی شیعرو په‌خشانی لاواننه‌وه‌دایه‌و له هه‌موو سه‌رانسه‌ری کوردستاندا به گۆرانی‌یه‌و ئه‌یڵێن ، مه‌مو زین خۆشه‌ویستی یه‌کتری بوون ، به‌ڵام مه‌م له ڕووی ڕه‌گه‌زی باو باپیرو بـاری کۆمه‌ڵایه‌تیه‌وه لـه ئاسـتی خۆشه‌ویسته‌که‌یدا نه‌بووه ، ئه‌میری بۆتان که برای زین بووه به‌م خۆشه‌ویستی‌یه‌ی زانیووه‌و ڕقی له مه‌م هه‌ڵگرتووه‌و به‌ندی کردووه . به‌ڵام له ترسی یاخی بوونی میللی به‌ری داوه‌و به ژنو مێردایه‌تیان ڕازی بووه ، مه‌سه‌له‌که ته‌واو

---

(٣) چاووگی کوردی ( زانین ) له‌گه‌ڵ چاوگی ( سلاڤی )و هه‌روه‌ها ( زنات )ی ڕوسیشدا له‌یه‌ك ره‌گه‌زنو لـه هه‌موو ئه‌و زمانانه‌دا به مانای ( زانین ) دێت .

ئەبێ‌و مەمی زاوا لە تاو خۆشەویستەکەی ئەمرێت ، ئیتر هەر لە دووای ئەوزینیش ئەمرێت‌و هەر لە پەنای ئەودا ئەینێژن ، لە نێوان ئەو دوو گۆڕەدا هەر وەکو نیشانەیەکی دیار بۆ ئەو خۆشەویستیەی کە لە مردن بەهێزتر بـووە گوڵ‌و گوڵزاری زۆر سەوز بووە(٤) .

هونەری شیعر لە نـاو کوردەکاندا زۆر فراوانـە ،

کوردو خوێنەواری لە کانی ئیشی ڕۆژانەدا

---

(٤) تێکستی پاڵەوانیەتیەکەی ئەحمەدی خانی کاری لە تێکستەکەی ژابا کردووە ، بـەڵام تێکستەکەی کە لۆسکارمان لە مەریوان نووسیوویەتی ڕووداوەکانی لـەم سەردەمەی ئێمەوە نزیکن ، ئەمەو ئـەو لـە تێکستەکانی تر واقعی ترە .

سروشتیشه که ئێمه ناتوانین بەرهەمی شاعیرەکانی ئەمان لە بەرهەمی شیعری ئیسلامی باشتر دابنێین ، هەر لەمکاتەدا ئەبێ باسی ئەوە بکەین کەلاوازی لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردیدا گاری کردۆتە سەر ئەو مەسەلەیە .

هەشت شاعیری کۆنی کورد بە ناوبانگو دیارن(٥) ، لـــە هەموویان کۆنتر مەلای جەزیری‌یە کە لە ســـەدەی یانزەهەمی زایلی‌دا ژیاوەو هارتمان لە سالی ١٩٠٤ دا لە ئەلمانیا بە لیتۆگراف بەرهەمەکانی بلاْوکردۆتـــەوە ، رۆژهەلاْتناسی نەیتوانیوە پسپۆرێکی‌وا بدۆزێتەوە بتوانێ ئەم دیوانە وەربگێرێت ، بەلاْم لـــەوەی پەیوەندی بـــە سەردەمی تازەوە هەبێت ، من وا ئەزانم مەڵبەندی سەرەکی شاعیرە کوردەکان گوێزراوەتەوە بۆ سلێمانی ، کە شاعیری زۆر بە ناوبانگ نالی تیا ژیاوە .

وەکو نموونەیەك بۆ شیعری کوردی ئەم دوو وێنەیە پێشکەش ئەکەین :ـ

ـ ١ ـ زولفت لە قەدت‌دا کە پەرێشان و بلاْوە
ئەمرۆ لـــە ملی شـــیفتە ئالۆزو بـــلاْوە
بۆچی نەگریم سەد کەرەتم دڵ دەشکێنی
مەی بۆچ بەری شوشە لە.سەد لاوە شکاوە

(٥) بروانە ژابا ، تێبینی ، پیتر سبورك ، سالی ، ١٧٦٠ ، لاپەرە ، ٧ ـ ١١ ، بە زمانی رووسی .

ـ ٢ ـ هەر چەندە کە رووتم بە خودا مایلی رووتم
بێ بەرگیە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە(٦)

ئەمەش چەند نموونەیەکی شیعری میللی کوردییە .

ـ ١ ـ ئای لیلێ عەیشان ، چیاکان بەرزن و ناتووانم بتبینم
چەندەم حەز ئەکرد بەدەستی خۆم یاریت پێ بکەم
کەس نییە لەم دنیایەدا لە تۆ بچێت
سەنتورێك دروست ئەکەم چواردە تاڵی هەبێ
سزای من لە تاڵەکانیدا ئەبێت .
لە ئێسقانی چۆلەکە سەنتورێك دروست ئەکەم
تاڵەکانی لە پەلکەکانی قژی بوکێ دروست ئەکەم
ئای لەیلێ عەیشان ، تۆ پاشای خۆم و دڵمی
تۆ ئەو گوڵەی کە ئێستا کراویتەوە .

---

(٦) ئەم دوو پارچە شیعرە لە سەر زمانی کوردێکەوە لە سابلاغدا نووسراوە، وا ئەزانم شیعری نالین تێبینی :ـ ئەم سێ دێرە شیعرە بەڕاستی شیعری نالین ( ١٨٠٠ ـ ١٨٥٦ ) وە لە یەك غەزەلن ، دێری یەکەم و دووەم سەرەتای غەزەلەکەن ، بەلام دێری سێیەم لە غەزەلەکەدا دێری چوارەمەوە هەموو غەزەلەکەش خۆی نۆ دێرە ـ مارف ـ .

دایكت و باوكت بەچاووی غەزەبەوە سەیری
هەردووكمان ئەكەن(٧) .

ـ ٢ ـ كاتێ كە ئەمنێنە گۆڕ

با لەیلێ لەپشت سەرمەوە بووەستێ

بالێم بپرسێ : ئەوە چیتە ؟ كوا پاشا ، تۆ چاو و
گەنجیەتیمی(٨)

واز لە رەخنە گرە بێبەزەییەكان بهێنە و وتەكەی پۆشكێن دەربارەی گۆرانیە قەفقاسیەكان ئەگێڕینەوە ، وە با لە خراپترین حاڵدا باسی شیعرەكانی شاعیرە كوردەكان بكەن و بڵێین ( رۆژهەڵاتی یەو مانای نی یە ، بەڵام هەندێ مانای شیعری تێایە ) ، لەگەڵ ئەوەشدا

---

(٧) ئەم پارچە شیعرە میللی یە لە تۆمارەكانی ( پریم سۆتسین ) ـە لە تۆرعابدین ـ تێبینی ـ لەم كاتەدا ئەو كتێبەم لانیە ، لەبەر ئەوە نەم توانی تێكستە كوردی یەكەی ئەم شیعرە بنووسمەوە ، بۆیە هەر وەكو چۆن مینۆرسكی بەرووسی نووستبوی كردم بە عەرەبی ـ مارف ـ .

(٨) لە نووسینەكانی ئۆسكارمان (شێوە زمانی كوردی) شێوەو نارەڕۆكی ئەم گۆرانی یە كە لەسەر سێ دێڕ دانراوە گۆرانی یە میللی یە ئەسپانیەكانمان بیر ئەخاتەوە .

ئاشكرایە ئەدەبی میللی كوردی لەو منداڵ بازارە ناشیرینە ناچێت كە لەم تازەییەدا لە هەندێ رۆژنامـــەدا بەناوی ( سرودی كوردی )(٩) یەوە دەركەوتن . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە كە شێوە زمانی گۆرانی(١٠) لە كوردستانی خوارووودا دەورێكی گرنگ ئەبینێ و زاڵ بووە بەسـەر زمـــانی فارســـیدا ، وە ئەم شـــێوە زمانـــە كەلەپووری تایبەتی خۆی هەیـــەو وا ئەزانرێ كە لە شێوە زمانـــە كوردی یەكان نەبێت(١١) . بەم شێوە زمانە گەلێ ئەفسانەی

---

(٩) نازانین نووسەر مەبەستی لە كام سرودەیە ـ مارف ـ .

(١٠) بەم شێوەیە ئەبێ لـــە پەنای شێوە زمانـــە تایبەتیە كوردی یەكاندا باسی دوو شێوە زمانی تریش بكەین كە ئەوانیش ( زازا ) و ( گۆرانی )ن . و ئەوانـــەی پێیان ئەدوێن هەر بە كوردی ئەدوێن .

(١١) ئەمە ڕای جەماوەری رۆژهەڵاتناسانە ، لە كاتێكدا كە بە شێوە زمانی كوردی دانانێن ، یاخود گومانیان لێ یەتی ، نایشی خەنە سەر فارسی ، بەڵكو بەشێوە زمانێكی ئێرانی دائەنێن ( نەك زمان بەواتای وشـە ) گومانی تیانی یە وشەی (شێوە زمانی ئێرانی) وشەیەكی تەواو نی یە ، چونكە ئێمە ئەزانین كە زمانی ئێرانی كۆمەڵە زمانێكە ، بەڵام ( شێوە زمانی ئێرانی ) هەر ئەبێ سەر بە زمانی ئێرانی بێت ، ئەمەو زانا كوردەكان دەربارەی ئەم بابەتە زۆریان نووسیوەو شێوە زمانی

رۆژهەلاتی ناسراو نووسراوە ، ( لەیلێ و مەجنون ) و ( شیرین و خەسرەو ) و ( خورشیدو خاوەر )و هینی تریش ، گەڕۆکی ئینگلیزی ( ریچ )(١٢) لە سەرەتای سـەدەی رابوردوودا گەلێ دەستنووسی ئەم ئەفسانانەی هێناوەو ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانیادا دانراون ، هەروەها منیش لە سالی ١٩١٤دا ژمارەیەك دەستنووسی تازەی ئەو ئەفسانانەو هینی تریشم دەست کەوت .

یەکەم ڕۆژنامەی کوردی پێ ی ئەووترا ( کوردستان ) وە لـە سالی ١٨٩٨ دا لە قاهیرە دەرچووە(١٣) دووای

---

گۆرانی بە شێوە زمانێکی کوردی دائەنێن ، دووای ئەوە ئەو ئەدەبەی بەو شێوە زمانە نووسراوە ، لـە لایەن کوردەکان خۆیانەوە تـەواو کراوەو کەس باسی نەکردووەو تەنانەت فارسەکان خۆیشیان لەناو مێـژووی گشـتی ئەدەبەکەیانـدا تـۆمـاریـان نەکردووە ـ مارف ـ .

(١٢) کۆمەلەکەی ( ریچ ) لە کەتەلۆکی دەستنووسەکان لە مۆزەخانەی بەریتانیا •

(١٣) یەکەم ژمارەی ئەم رۆژنامەیەم لەنامەخانەی ئامۆژگای نەتەوەکانی ئاسیای سەر بە ئاکادیمیەی زانستی سۆڤیەتی لە لینینگراددا دۆزیەوە ، بە چوار لاپەڕە دەرچووە ، لەگەل پاشکۆیەکدا بەزمانی فەرەنسی وەکو پڕوپاگەندە بۆ رۆژنامەکە ، سەرنووسەری ئەم ژمارەیە مەدحەت بەدرخان بووەو لە ڕۆژی / ٢٢ /ی نیسانی ١٨٩٨دا دەرچــووە ـ مارف ـ .

ئەوە گوێزراوەتەوە بۆ حنێف ، عبدالرحمن بـەگ کە بەکێك بووە لە کوڕەکانی بەرخان دەری کردووە . بەڵام ڕۆژنامەی دووەم دووای شۆڕشی تورکی دامــەزراوە (مەشروتەـ مارف) شێخ عبدالقادر دای مەزرانــدوە ، بەڵام زۆری نەخاباندوە ، لە دووابیدا کۆمەڵێك لە

منداڵانی کوردی ئەم سەردەمەو خوێندن لە
قوتابخانەی لادێکاندا

کوردەکان لە ساڵی ١٩١٣ دا لە ناوجەماوەری قوتابیانو ڕۆژنامە نووســانــدا کۆمەڵەی ( هیڤیــا کوردی ) یان دامەزراندوەو دەستیان کردووە بە بڵاوکردنەوەی گۆڤاری

(رۆژی کورد)ی (١٤) مانگانە ، ئەم گۆڤارە رێڕەوێکی نەتەوایەتی ئاشکرای هەبووە ، لەسەر بەرگی گۆڤارەکە وێنەی پیاوە گەورەکانیان بڵاوکردۆتەوە ، وەکو سەلاحەددین و کەریم خانی زەند . وە هەستی نەتەوایەتی لە ناخی کوردەکاندا بڵاوکردۆتەوە ، هەروەها پرۆژەیەکی ئەلف و بێی تازەی بۆ زمانی کوردی داناوە ، وە لە ساڵی ١٩١٤دا ناوی گۆڤارەکەیان گۆڕیوە بە (هەتاوی کورد) و ، وا ئەزانم رەواجی هەبووەو بە فراوانی بڵاوبۆتەوە ، بەش بەحاڵی خۆم دەربارەی ئەم گۆڤارە لە ناوچە دوورەکانی سلێمانیشدا شتم بیستووە ئەمیرەکانی ناوخۆی کوردو رۆشنبیرەکان بەچالاکی و گورج و گۆڵیەوە سەر لەنوێ بایەخیان بەمەسەلەی نەتەوایەتی داوە .

میسیۆنێرە پرۆتستانتیەکان (مبشر) بەیارمەتی کۆمەلە ئەڵمانیەکانی کە لە سابڵاغدا کاریان کردووە ، لە سەرەتای جەنگدا گۆڤارێکی بچوکیان بەناوی (کوردستان)(١٥) دەرکردووە . گەلێ وتاری دەربارەی رێزمان بڵاوکردۆتەوە ، هەروەها نموونەی شیعری میللیش

---

(١٤) دەربارەی ئەم گۆڤارە تێبینیەك هەیە (سەیری س . م . شاپشال) لە کۆمەڵی رۆژهەڵات ناسانی رووسی بکە ، لاپەڕە ، ٢٣٣ ، تێبینی ـ یەکەم ژمارەی ئەم گۆڤارە لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩١٣دا دەرچووە ـ مارف ـ .

(١٥) ژمارەی یەکەمی کەلای منە لە نیسانی ساڵی ١٩١٤ دا دەرچووە .

که له کتێبه‌کانی ئۆسکارمانه‌وه وه‌ریان گرتووه.

گه‌لێ باس‌و لێکۆلینه‌وه ده‌رباره‌ی گه‌لی کورد کراوه، به شێوه‌یه‌کی تایبه‌تی ده‌رباره‌ی زمانه‌که‌یان، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی ئه‌و گه‌شته‌وه‌ره رووسانه‌ی هاتوون بۆ کوردستان که‌من، وه‌کو ( بارون بۆدی، چیریکۆف(١٦)، خانیکۆف(١٧)، ف. ف مایێفسکی، پ.آ تۆمیلۆف،

---

(١٦) یادداشتی رۆژانه‌ی نوێنه‌ری رووس له سنووری تورکیاو ئێران - ١٨٤٩، ١٨٥٢ به‌سه‌رپه‌رشتی گامازوف له پیترسبورگ له سالی ١٨٣٥ دا بلاوکراوه‌ته‌وه، ئه‌م کتێبه‌چاکه نموونه‌ی نی‌یه‌و ده‌ست ناکه‌وێ، نووسه‌ر گه‌شتی زۆری کردۆته ئه‌و شوێنانه‌ی که عه‌قید چیریکۆف باسیان ئه‌کات، من به پێویستی ئه‌زانم که راستی قسه‌و هه‌لوێستی واقعی گه‌رۆکه ئه‌م دوپات بکرێته‌وه‌و پشتی بگیرێ‌و ئه‌توانین شانازی پێوه بکه‌ین، ئه‌م کاره‌یش هه‌تاکو ئێستا گرنگی زانستیانه‌ی خۆی پاراستووه.

(١٧) سه‌یری گه‌شته‌که‌ی له کوردستانی ئێراندا بکه، ده‌نگو باسی کۆمه‌له‌ی جوگرافی ئیمپراتۆر، سالی، ١٨٥٢، به‌شی شه‌شه‌م، به‌رگی پێنجه‌م، لاپه‌ره، ١ - ١٨ - وه له نووسینه‌کانی به‌شی قه‌فقاسی کۆمه‌له‌ی جوگرافی ئیمپراتۆری‌یه‌تی رووسی، سالی ١٨٥٢. له کتێبی یه‌که‌مدا ده‌رباره‌ی سنه، تێبینی‌یه‌کانی ئه‌مهر گاگارینی تیایه.

ك.ن سمیرنوف(١٨)، ماکسیمۆڤیچ، ڤاسیلکۆڤسکی و گەلێکی تریش )(١٩)، بەڵام ئێمە ئەتووانین بە شانازی یەوە بڵێین کە شوێنی لێکۆڵینەوە زانستیەکانی دەربارەی کوردەکان رووسیایە. لە ساڵی ١٧٨٧ دا ئاکادیمی (پالاس) لەسەر فەرمانی ئیمپراتۆر (کاترین)ی گەورە، فەرهەنگێکی بەناوی (فەرهەنگی بەراووردی بۆ هەموو زمان و شێوە زمانەکان) دەرکردووە، کە لەم فەرهەنگەدا بۆ یەکەمجار لەگەڵ زمانەکانی تردا، ٢٧٦ وشەی کوردیش چاپکراوە.

ئەوەی سەیرە، هەر وەکو زۆر جار لـــە مێژووی زانستیدا ڕوو ئەدات، ئەوەبو کە لەو کاتەدا لـــەم کارە لەگەڵ کارێکی تریشدا یەکیان گرت، بێگومان ئەم دوو رووداوەش هیچ پەیوەندی یەکیان بەیەکەوە نەبووە، ئەم کارە یەکەم رێزمانی کوردی بوو کە بە زمانی ئیتالی لە ساڵی ١٧٨٧ دا لە ڕۆما دەرکەوت، نووسەرەکەی میسیۆنێری کاسۆلیکی (ماورێزیۆ گارزۆنی) بوو، نووسەر ١٨ ساڵ

---

(١٨) ك. ن. سمیرنۆف، گەشتێك لە سەرووی کوردستاندا، دەنگوباسی بەشی قەفقاسی کۆمەڵەی جوگرافی ئیمپراتۆری یەتی رووسی، بەرگی ٢٧، ژمارە، ٤، ساڵی، ١٩٠٤.

(١٩) گەشتێك بۆ وڵاتی فارس، دەنگو باسی بەشی قەفقاسی کۆمەڵەی جوگرافی ئیمپراتۆری یەتی رووسی، بەرگی، ٢٧، ژمارە، ٤، لەگەڵ راپۆرتێکدا دەربارەی گەشتەکە.

پێش دەرچوونی کتێبەکە لـــە ئامێدی دووردا ژیـاوە ؛ ئەتوانین نارەحەتی و ناخۆشی ژیان لـــە ناوچـــەرگەی کوردستاندا پێش ١٥٠ ســـاڵ بێنینە بەرچاوی خۆمـان ، تێکۆشانی باوکە گارزۆنیو خزمەتە هـــەرە چاکەکەی ئەو مافەمان ئەداتێ کە بە(باوکی لێکۆڵەرەوە کوردییەکانی) دابنێین ، بەڵام ئەوەی کە بڵێین لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی کورد لە پاشەڕۆژدا چۆن گۆڕانیان بەسەرداهات ، ئەویان تەنها بەکەڵکی پسپۆرەکان دێت ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ حاڵەتی دەگمەن هەن ،وەکو ئەوەی هەندێ لەو زانستیانەی کە دەربارەی ئەم گەلە دەرکەوتن لـــە رۆژهەڵاتناسیدا بوونە سەرکەوتنێکی جیهانی .

هەر لەسەدەی هەژدەهەمەوە ئێمە ئـەزانین هەنـــدێ بڕوانامەی مێژوویی دەربارەی عەشیرەتە کوردەکان هەن ، ئەوانەی دەست نیشانمان کردوون ، ئەمانە لەو سەردەمانەدا کە ئێمە زانیاری کەمو بەیەکدا چـــوومان دەربارەیان هەبوو گرنگی خۆیانیان لـــە روون کردنەوەی هەنـدێ لایەنی ژیانی ئەمارەتە کوردییەکاندا دەرخست ، گەرچی کە ئینگلیزییەکان بە هەوڵێکی زۆر توانیان هەندێ لیستەی ناوی ئەم عەشیرەتانە بەدەست بهێنن و ئەو لیستانەی کەوتە دەست سوپـای ڕووسەکان باشترین لیستەی ئەو لیستانـــە بوون ، وە لەساڵی ١٨٢٨ داو لە رۆژانی شەڕی رووسیاو فارسدا جەنەراڵ (مۆختیلین) شاری ئەردە بێڵی داگیر کرد، لـــەو شتانەی کە دەستی بەسەردا گیـــرا ، نامەخـانـــە بەناوبانگەکەی سەفەوییەکان بوو ، وە لـــەم دوواییەدا

گوێزرایەوە بـۆ پیترۆگراد ( لینینگرادی ئێستا ـ مارف )
کتێبی مێژوویی شەرەف نامەش لەناو ئەو کتێبە زۆرانەدا
بوو کە لە ناو نامەخانەکەدا بوون .

بەڕاستی دانەیەکی بێ‌هاووتا بوو ، نووسەرەکەی لە
ساڵی ۱۵۹۹ی زاینیدا خوێندبوویەوەو ( سەرلەنـوێ
نووسیبوویەوەو پاکی کردبووەوە ) و ئیمزای کردبوو ،
زاناکانی لای ئێمە بە شـێوەیەکی باش قـەدری ئەم
دەسنووسەیان زانیوو بایەخیان دایـە ، وەك هەنگاوێکی
سەرەتایی ـ ئاکادیمی ڤبلیامیوڤ ـ زیرەنۆڤ ـ هـەموو
دەقە فارسی‌یەکانی بلاوکردەوە ، دووای ئەوە ئاکادیمی
( شارموا ) کتێبەکەی بەزمانی فەرەنسی‌و لە چوار بەرگدا
بـلاوکردەوەو هـەموو ژیانی خـۆی لـەوکارەدا
بـردۆتـەسـەر(۲۰) .

ناوچەی سمۆلێنسکی لە ماوەی شەڕی قرمدا هەندێ
دیلی تورکی تیابوو ، هەر ئەم دیلانە کۆمەڵێ کوردیان
تیابوو ، ئاکادیمیەی زانستی ( لیرخ )ی بۆ ناردن‌و ئەم
بـۆ یەکەمجار هەندێ تێکسـتی کوردی زانسـتیانەی

(۲۰) شارموا لەسی‌یەکاندا لەو دەسنووسەدا دەسـتی بە
ئیش کردن کردووە ، بەلام بۆ ماوەی دووساڵ وازی
لە ئیشەکە هێناوەو تەنها لە ساڵی ۱۸٦۸دا توانیوویەتی
یەکەم بەرگی وەرگێڕانەکەی بلاوبکاتەوە ، بـەلام
بەرگی چوارەم ( یاخود کتێبی دووەم ) لە ساڵی
۱۸۷۵ دا دەرچووە .

دەربارەیان بڵاوکردەوە(٢١) . دوو کابرای رووسی تریش کە خاوەنی بڕوانامەی ماجستێر بوون ، دەربارەی کوردیان نووسیوە ، ئەوانیش ( بیریزین ) و ( دیتیل ) بوون ، کە لەچلەکانی سەدەی ڕابووردوودا چوونەتە رۆژهەڵات ، دوو ڕووسی تریش هەمدیسان ئیشیان لەم دووانە زۆرتر کردووەو ئەوانیش هەردوو قونسوڵ ، (آ، خۆدزکۆ ) و (آ. ژابا ) بوون ، یەکەمیان زۆر حەزی لەگەڕانو سەیرکردن کردووە ، گەشتی زۆری کردووەو زۆریشی نووسیوە ، لە پاریس چاوی بە یەکێك لە کوردە روشنبیرەکان کەوتووە ، دووای ئەوە بەزمانی فەرەنسیو ( لە گۆڤاری ئاسیا ) دا ١٧٥٧ وتارێکی دەربارەی شێوە زمانی سلێمانی (شێوە زمانی رۆژهەڵات ) بڵاوکردۆتەوە .

بەڵام قونسۆڵ ، (آ، ژابا ) لە ساڵی ١٨٤٨؛ تا ساڵی ١٨٦٦ لە ناوچەی ئەرزرومدا بووەو خەریکی خوێندنی شێوە زمانی رۆژئاوای زمانی کوردی بووە .

وە کۆمەڵێك لە رۆشنبیرانی کورد دەورەیان داوەو ، بەیارمەتی ئەوان کۆمەڵێ وتاری نووسیوەو فەرهەنگێکی

---

(٢١) لێکۆڵینەوە دەربارەی کوردی ئێران ، کتێبی یەکەم بریتییە لەسەرەتاو باس کردنێکی درێژی عەشایەرە کوردەکان ، پیترسبورك ، ١٨٥٦ ، کتێبی دووەم ، تێکستی کوردی تیایە بەزمانی زازا ، ١٨٥٧ ، کتێبی سێیەم فەرهەنگو تێبینی مێژوویی و ئەدەبی یە -تێبینی- ئەم کتێبە بەزمانی رووسی و ئەڵمانی دەرچووە -مارف- .

کوردی ـ فەرەنسی داناوە ، لەگەڵ کتێبێك دەربارەی چۆنیەتی قسەکردن بەزمانی فەرەنسیو کوردیو لە دوواییدا فەرهەنگێکی گەورەی فەرەنسی ـ رووسی ـ کوردی، بەشێوەیەکی ئاکادیمیانەی زانستی نووسیوە(×) .
بەڵام تەنها ئەو دوو ئیشەی یەکەمی بڵاوکردۆتەوەو ئیتر ئەو دوو ئیشەی کەی تری کە گرنگیەکی زانستیانەی گەورەیان هەیە پشت گوێ خراوون ، بە شانازیەوە ئەڵێم ، من ئەوانەم بەرێکەوت دەسکەووت*، لە ساڵی ۱۹۱۳دا نەوەکانی (ژابا) هەموو دەسنووسەکانی باپیرەیان دامێ و منیش هەموو تواناى خۆم بەکار ئەهێنم بۆ چاپکردنیان(۲۲)،وە لە دوواییدا ،پرۆفیسۆر (یگیازاروْف)

---

(×) هەندێ لەو دەسنووسانەی کە ژابا ئامادی کردوونو دەستی خستوون لەلایەن پرۆفیسۆر مارف خەزنەدارەوە بۆ یەکەمین جار بڵاوکراونەتەوە ، بۆ ئەم مەسەلەیەش بڕوانە .
أ ـ دەستووری زمانی عەرەبی بەکوردی،عەلی تەرەماخی، سەدەی حەڤدەهەمی زایین ، بەغداد ، ۱۹۷۱ .
ب ـ فەرهەنگۆکێکی کوردی ، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، ژمارە ، ۱۷ ، بەغداد ، ۱۹۷٤ .

(۲۲) مینۆرسکی نەیتوانیوە ئەم ئیشە زەروورییەی لێکۆڵینەوەکانی کورد تەواو بکات ، چونکە دووای شۆڕشی سۆشیالیستی ، ئیتر لە نیشتمانەکەی دوور

دەربارەی کوردەکانی رووسیا لە ناوچەی ئەریڤانداو لە حەفتاکانی سەدەی رابووردوودا شتی نووسیوەو لێیان کۆڵیوەتەوە. هەر لە منداڵیەوە بە زمانی کوردی قسەی کردووە ، لەبەر ئەوە توانیوویەتی گەلێ شتی بەکەڵك بزانێ‌و بنووسێ(٢٣) .

نووسین‌و لێکۆڵینەوە رووسی‌یەکان دەربارەی کورد لە دەرەوەی وڵاتدا بڕوا پێ کراو بوون ، لەبەر ئەوە ئەبینین ئیشەکانی زانا ئەڵمانیەکان وەکو ، (یوستی ، پریم ، سۆتسین )و هەروەها ئەو تێکستانەی کە (ماکاشی) نەمساوی نووسیبونی ، هەموویان دران بە ئاکادیمیەی زانستی ئێمە بۆ چاپکردنیان ، بەم شێوەیە هەموو ئیشە زانستی‌یە بەکەڵکەکانی دەربارەی کوردەکان لە پیترۆگرادی لای ئێمەدا بوون .

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە لەم رۆژە نزیکە

---

←

کەوتۆتەوەو هەتا ئێستاش ئەم بابەتانە لە ئەرشیفی (ژابا) دا لە ئامۆژگای نەتەوەکانی ئاسیای سەربە ئاکادیمیەی زانستی سۆڤیەتی‌و ئەرشیفی بەشی رۆژهەڵات لە ئاکادیمیەی زانستی سۆڤیەتیدا لە لینینگراد هەر هەڵگیراون ـ مارف ـ .

(٢٣) نووسینەکانی بەشی قەفقاسی کۆمەڵەی جوگرافی ئیمپراتۆری‌یەتی رووسی ، کتێبی سیانزەهەم بلاوکراوەی دووەم ، ساڵی ١٨٩١ .

رابووردووانەدا و لە ئەڵمانیا هەوڵێکی تازە درا بۆ ئەوەی دەست بگرن بەسەر ئەو ئیحتیکارە زانستییەی لای ئێمەدا ، کاتێك کە زانای ئەڵمانی ( ئۆسکارمان ) بەیارمەتی ئیمپراتۆر بۆ ماوەی چوار ساڵ لە وڵاتی فارس و تورکیادا خۆی بە گەشتێکەوە خەریك کردوو بە شێوەیەکی تایبەتی دەربارەی کوردەکانی نووسی . ئایا ئەم بایەخە دووایییەی بە کوردەکان دەست تێوەردانی مەسەلەی کورد نەبوو ؟ ! ! ! .

تازەترین شت لەم رووەوە رێزمانی کوردی (سۆن)ی ئینگلیزی بوو ، کە لە ساڵی ۱۹۱۳دا دەرچوو(٢٤) ، ئەم کتێبە بە کەڵکەو شەخسیەتی دانەرەکەی زۆر سەرسور-هێنەرە ئەم کابرایە بەشێوەیەکی نهێنی موسڵمان ئەبێ و ، ماوەیەکی زۆر بە دزییەوە بەناو (میرزا)ی فارسییەوە لە کوردستانی خوارووەدا ژیاوە .

لەم کاتەی ئێستاشدا ( ئۆربێلی ) لە زانستگای پیترۆگراددا خۆی ئامادە ئەکات بۆ خوێندنی زمانی کوردی ، ئێمەش هیوادارین ئەم ببێتە هۆی زیندوکردنەوەی

---

(٢٤) هەروەها کتێبێکی چاکتری بەناوی ( گەشتی خۆ گۆرە-کە لەوڵاتی نێوان دوورووبار -وڵاتی میزۆپۆتامیا)- و کوردستاندا لە ساڵی ۱۹۱۲ بە زمانی ئینگلیزی نووسیوە. ئەوەی شایانی باسە ، ئەوەیە کە (سۆن) تورکەکانی خۆش نەویستووە ، بەڵکو کوردەکانی خۆشویستووە .

خوێرەوشتی سەرۆکایەتی رووسیا لــە لێکۆڵینــەوەی کورد ناسی دا(٢٥) .

(٢٥) ئاکادیمی ( یووسف بکاروڤیچ ئوربیلی ) لــە ســاڵی ١٨٨٧دا لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٦١دا لە شاری لینینگراد مردووە ، لە راستیدا ئەم لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا خووڕەوشتی سەرۆکایەتی رووسیای لە ئامۆژگای نەتەوەکانی ئاسیادا دامەزراندوەو خۆی کردووە بە سەرۆکی بەشەکە . (ژمارەی قوتابیانی قوتابخانەی ( ئۆربیلی ) کوردۆلۆجی ئەگەنــە (٤٠) قوتابی و ئەمانە لە سەرانسەری یەکیەتی سۆڤیەتدا کارئەکەن ــ مارف ــ .

## ئـــايــيــن

بەشی زۆری کوردەکان لە رووی بیروباوەڕی ئاینی یەوە موسوڵمانی سوونیین ، ئەم مەسەلەیەش لە رووی بەرانبەر بوونەوەی فارس و تورکەکانەوە لە کوردستاندا بەچاکەی تـورکەکان تـەواو بـوو ، تورکەکان لـە رۆژانی هێرشەکەیاندا بۆ سەر ئێران لە سالی ١٩٠٥ ـ ١٩١٢ دا ئەم لایەنەیان بە هەل زانیو تاهیر پاشای سەرکردەیان لە بەردەمی شاهیدا باسی ئەو باوەڕەی خۆی کردووە کە ئەڵێ ( کوردەکان هەموویان سەر بە دەوڵەتی عوسمانین ) ، بەڵام لە ڕاستیداو بەچاو پۆشین لـە بڕوای سووننی ، کوردەکان سەر بە بڕوایەکی ترن کە ئەویش بـڕوای شافیعیە ، وەکو زانـراوە تورکەکانیش حەنەفین(×) ، هەروەها ئاشکراشە ئەم ڕواڵەتە بچوکانە ئەتوانن ببنـە بناغەیەك بۆ هەڵگیرسانی دووبەرەکیو جیاوازی .

ڕواڵەتی تریش هەن کە توانیوویانە دەورێ گرنگ

---

(×) رەنگە نووسەر لەم ڕووەوە زۆر شارەزا نەبووبێ ، ئەگینا لە ئاینی ئیسلامدا بڕوای شافیعیو حەنەفیش هەر لە لقەکانی باوەڕی سوونین .

ببینن ، هەندێ ئەڵێن گوایا ئەمانە نەوەی خێزانی یەکەمین خەلیفەکانی ئەمەوی و عەبباسی یەکانن ( سەیری شەرەف نامە بکە ) ، سەرگوروشتەیەکیش هەیە ئەڵێ ئاڵای کۆنی عەبباسی یەکان تاکو ئێستاش لە بۆتاندا هەر ماوە ، هەر لەبەر ئەم هۆیە مافی فەرمانڕەوایەتی دراوە بە تورکەکان ، ئەمەش مەسەلەیەکە تەنانەت لە جیهانی ئیسلامی خۆیشیدا موناقەشەی لەسەر ناکرێت(١) ، بەڵام کوردەکان خۆیان ئەتوانن رێگایەکی ئاینی دیاری کراو بگرن و گوێ بە قوستەنتینیەش نەدەن .

لە کوردستانی ئێراندا لە ( ناوچەی دەشتەتاڵ لە نزیك ـ بانەوە ـ لەگەڵ هەندێ هۆزی تردا لە زەهاو ) هەندێ هۆزی شیعەش هەن کە تاکو ئێستاش پەیوەندی خۆیان بە ئێرانەوە نەپچڕاندووە ، منیش شانسم هەبوو تووشی هەندێ پاشماوەی ئەم هۆزانە بووم کە تێکەڵاوی هۆزی تر بوون و بیروبڕوای خۆیانیان لە بیر چووبووەوە . لێرەدا گرنگە ئەوەیە کە بڵێین ـ شێخە ئاینیە کوردەکان خۆیان بە ئیسلامی رەسمی کوتومتەوە نابەستنەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە سوونین ، بەڵام هەڵوێستی جیا جیایان هەیە ، شێخەکانی

---

(١) دەربارەی هەڵەی ناونانی سوڵتانەکانی عوسمانی بە خەلیفە ، بڕوانە ف . ف . بارتۆڵـد ، خەلیفەکان و سوڵتانەکان ، گۆڤاری ، ( جیهانی ئیسلامی ) ١٩١٢ ، ژمارە ، ٢ ، ٣ ، بە زمانی رووسی .

شەمدینان(٢)و شارەزوور (لە تەوێڵەو بیارەی هەوراماندا) سەر بە ڕێگای سوفی گەری نەقشبەندین ، ئەمانە لە خەڵکانی تر زیاتر خۆیان بە ڕێرەوی ئیسلامەوە بەستۆتەوەو بایەخی ئەدەنێو بڕوایان بە پاکی خوێنی خێزانەکانیان هەیەو هەروەها بڕواشیان بە پیرۆزی گۆڕی باوباپیرانیان و بەتوانای ڕۆحییان هەیە ، ئەم بزوتنەوە سۆفی گەری یە لە مێژووی ئێمەدا دیاروو ئاشکرایە ، زۆر چاك ئەو ڕۆژەم لە یادە کە ئەفسەرێکی تورکیو سوارەکانی هاتنە لای شێخ عەبدولقادری ئەندامی ئەنجومەنی پیرانی تورکیا کە لە وڵاتی خۆیداو لە سەر سنوور دائەنیشت ، ئەمانە بەڕێزەوە لێی هاتنە پێشەوەو لە بەردەمیا هاتن بەچۆکدا (×)و دەستیان ماچ کرد ، بەڵام شێخەکانی شارەزوور ڕێزێکی سەیریان هەیە ، نەك تەنها لەناو کوردەکاندا ، بەڵکو تەنانەت خەڵکی لە ئاسیای ناوەڕاستو لە وڵاتی ئێمەشەوە ئەچن بۆ لایان و ئەچنە تەکیەکانیان کە وان لە ناوەڕاستی کوردستاندا . هەروەها سۆن باسی ئەو چاوپێکەوتنانە ئەکات کە لەگەڵ ئەو موسوڵمانە بێسارابیانەدا کردوویەتی

---

(٢) (پیر) یاخود شێخی کوردەکان ، مەولاناخالیدی سلێمانی لە شام نێژراوە ، بەڵام سەیید عەبدوڵلا کە باپیری شێخ عوبەیدوڵلای بەناوبانگە گۆڕەکەی وا لە ناوچەی شەمدینان ـ تێبینی ـ مەبەستی لە مەولاناخالیدی سلێمانی ، مەولاناخالیدی نەقشبەندی یە ـ مارف ـ .

(×) واتە چەمانەوە یاخود کڕنووشیان برد .

که له دووای گەڕانەوەیان له مەککەو بەغداد چوون بۆ (بیارە) بۆسەڕدانی شێخ . بەڵام ئەو شێخانەی که زۆر زیرەکن‌و له رووی بیروباوەڕەوە نەرم‌و نیانن بەزۆری له ناوچەی سابلاغدا بلاوبوونەتەوە(۳) ، وە من بەختم هەبوو که بەکێکیانم ناسی‌و چەند جارێك چاوم پێ‌ی کەوت.
ئەم پیاوە دەروێشێکی سۆفی بوو(×) ، پیاوێکی ڕوو خۆش‌و بەڕێزبوو ، زانیاری‌یەکی گشتیی زۆری هەبوو ، تاڕادەیەك شاعیریش بوو . هاوڕێی کۆنی گەشتەکانم (د. د. بلیاییف) له ساڵی ۱۹۱٤ دا چاوی بەم شێخە کەوتووە .

---

(۳) بۆ ئەمانە سەیری ( گەشتەکەم له مەراغەو ناوچەی ڕووباری جاکات‌و تاو تاو ) دا بکە ، دەنگو باسەکانی بارەگای سەرکردایەتی جەنگی ناوچەی قەفقاس ، ۱۹۰۷ ، ژمارە ، ۲۰ ، چاپە ئەشکراکەی بەزمانی رووسی .

(×) لێرەدا نووسەر زۆر شارەزا نەبووە ، ئەگینا خەلك که دەروێش بوو ئیتر سۆفی نابێ‌و که سۆفیش بوو دەروێش نابێ ، وە ڕێگای سۆفی گەری‌و دەروێشی جیاوازن ، بەڕێگای سۆفی گەری ئەڵێن (نەقشبەندی)و بەڕێگای دەروێشیش ئەڵێن ( قادری )و نووسەر خۆیشی هەر لەم کتێبەدا باسی ئەم مەسەلەیەی کردووە .

دەروێشەکانی ( لاإلەَ الاالله ) یان ئەکردوو (×) ، لـە سەرەتادا بەهێواشی خۆیان دەخست بەم دیودیوداو دووای ئەوە لەسەر نەزمی دەنگی دەفی گەورە گەورە خێرایان ئەکرد ، تا ئەگەشتنە حاڵەتێکی نائاسیو لەسەر خۆچوونو پاڕانەوە ، لە جێگای خۆیاندا دەستیان ئەکرد بەهەڵبەزینەوەو لەناو خۆیشیاندا لەسەری یەکتری یان ئەدا ، یاخود شۆقیان ئەدا لە دیواری ژوورەکەو بە خێرایی خۆیان بـا ئەداو پرچە زۆرەکانیان بەملاولادا بلاو ئەبووەوە ، ئەم کوردانە جۆرە جموجوڵێکی هیستریاییان ئەکردو ئەچوونە نـاو کۆڕێکی زیکری بازنەییەوە ( بێگومان ئەم کۆڕە شێتانەیە کاری ئەکردە سەر بینەران )(٤) ، ئەم ڕواڵەتە بەلای ئەو ئەوروپاییانەوە کە لەوێ بوون شتێکی سەیر بوو ، تەنانەت یەکێکیان مەسەلەکەی لا پەسەند نەبوو ، داوای لە شێخ کرد کە فەرمان بدات کارەکە بووەستێنن ئیتر هەر لەگەڵ

---

(×) ئەم مەسەلەیە کۆڕی زیکری دەروێشی لای خۆمانە ، کە تاکو ئەمڕۆش لە هەموو سەرانسەری کوردستاندا هەر هەیە .

(٤) د. بلیاییف ، وتارێك دەربارەی بەشـی سەرووی ـ ڕۆژهەلاتی کوردستانی ئێران ، دەنگوباسی بارەگای سەرکردایەتی جەنگی ناوچەی قەفقاس ، ١٩١٠ ، ژمارە ، ٢٩ ، ٣٠ ، بەزمانی رووسی ، ئەمە وتارێکی گرنگە ، دەربارەی ئەنتۆگرافیای ناوچـەکە گەلێ زانیاری تیایە .

شێخ ئیشارەتێکی بچوکی کرد یەکسەر هەموو شت هێواش بووەوەو عەقڵیان هاتەوە سەر خۆیانو سارد بوونەوە . بەم شێوەیە ئەبینین سۆفی گەری سەرەتایەکی تایبەتی هەیەو ئیسلامەتیەکی تەواویش نی یە(×) ، لەگەڵ ئەوەشدا ژیانی ئایینی کوردەکان لە ڕووی بیروباوەڕەوە جیاوازی یەکی گەورەی تیایە ، دوو ئایینی ئەوپەڕگیری (متطرفی) سەیریان هەیەو لەسەر بناغەو کۆڵەکەی کوردانە وەستاوون .

یەکەمیان ( یەزیدی یە )(٥) ، ئەم ئاینە لەسەر ڕێوشوێنی

---

(×) لێرەدا نازانم نووسەر مەبەستی چی یە ؟ ، لە پێشەوە باسی کۆڕی زیکرو کاروباری دەروێشی ئەکاتو لە دواییشدا مەسەلەکە بە صۆفی گەری ئەداتە قەڵەمو ئەشڵێ ( سۆفی گەری ئیسلامەتی یەکی تەواو نی یە ) ، لەگەڵ ئەمەدا کە لە ئیسلامدا وا باوە کە سۆفی گەری ئەوپەڕی ئیسلامەتیو خۆبەستنەوەیە بە هەموو گەورەو بچوکەکانی ئایینی ئیسلامەوە ، بۆیە ئەڵێم رەنگە مینۆرسکی بەهەڵەدا چووبێ ، یاخود ئـەو کەسەی لە کوردستان ئەو مەسەلەیەی بۆ باس کردووە زۆری لێ نەزانیووەو لە ئیسلام شارەزا نەبووە ، تێکەڵو پێکەڵ تێی گەیاندووەو شتەکانی تێکەڵاو کردووە .

(٥) (یەزیدی) ناوی میللی تایەفەی یەزیدی یە ، واتەزانرێ کە ئەم ناوە لەوشەی (ئیزد)ی ئێرانی کۆنەوەیـە کە مانای (خوا)یە .

بڕوایەکی زۆر کۆن ئەڕوات ، وە لەم ساڵانەی دووایىدا دۆزینەوەی ئەدەبی ئایینی یەزیدی گرنگیەکی گەورەی هەبوو ، نزیکەی سەد ساڵ لەمەوبەر ئێمە ئەوەمان زانی کە کوردەکان کتێبێکی ئایینییان هەیە ، بـەڵام نەمان ئەزانی چیتیایە ! ! . وە لـەساڵی ١٨٩٥ دا یەکێك لــە میسیۆنێرە ئینگلیزەکان ( ئۆ . باری ) توانی ئەو تێکســتە عەرەبییە بڵاو بکاتەوە کە دۆزیبوویەوە ، وە بریتی بوو لە دوو کتێبی بچوك ، ( کتێبی جیلوە ) و ( مەسحەفی ڕەش ) یاخود ( کتێبی ڕەش )(٦) ، بەڵام کابرایەکی ڕۆحانی کاسۆلیکی عەرەب ( ئەنستاس ماری ) تێکستە عەرەبییەکەو کوردییەکەشی لەیەك کاتدا بڵاو کردۆتەوە(٧) . تێکستە ئەسڵیەکە زۆر بە ڕێکوپێکی لە سنوقێکداو لـە کونجی کەنیسەیەکدا لــە چیاکانی سنجاردا هەڵگیرابوو . ( آ . ماری ) توانیبووی یەکێك لە پاسەوانەکانی رازی بکاتو ئاوا بە شێوەیەکی نهێنیو لە ماوەی دوو ساڵدا توانیبووی

---

(٦) هـ . پاری ، شەش مانگ لــە دێرێکی ئاسووریدا ، ١٨٩٥ ، تێکستی دووەم یەکێك لە گاورەرۆژهەڵاتیەکان چاپی کرد کەناوی ( عیسا یوسف ) بووە ، بە ناوی ( تێکستەکانی یەزیدی ) لە ( گۆڤاری ئەمریکی بۆ زمانە سـامیەکان ) دا ساڵی ، ١٩٠٩ ، بەرگی ، ٢٥ ، ژمارە ، ٢ ، ٣ .

(٧) گۆڤاری ئەنترۆبۆلۆجی ، ١٩١١ ، بەرگی شەشەم ، بەندی یەکەم .

نووسخەیەکی ڕاست وەکو دەسنووسەکە خۆی بنووسێتەوە، بەشێوەیەك، پارچەکاغەزێکی تەنکی خستۆتە سەر لاپەڕەی دەسنووسەکەو ئەو پیتەی لە کاغەزەکەوە دیاربووە وەکو خۆی خەتی بەسەردا هێناوەو ڕەسمی کردووە، ئیشەکە زۆر ناڕەحەت بووە، چونکە تێکستە کوردییەکان بە پیتی نهێنی تایبەتی بووە، بەڵام (ماری) تەنها دەسنووسەکەی نەنووسیوەتەوە، بەڵکو نیشانەکانیشی لێك داوەتەوە، وە لە دوواییدا (م. بێتنەر) لە ساڵی ۱۹۱۳ دا لە ڤیەننا ئەم تێکستانەی بەشێوەیەکی زانستیانە بڵاوکردۆتەوە.

ئەو شتەی کە جێگای داخە ئەوەیە کە زانا ئەوروپاییەکان لەم ڕووەوە هیچ کەڵکێکیان لە ئیشە ڕووسیەکان وەرنەگرتووە، گومانیشی تێدانییە کە ئەمانە نرخێکی گەورەیان هەیە، قونسوڵی ڕووسی، (یــو. س. کارتسۆڤ)(۸) لە ساڵی ۱۸۸٤ دا باسێکی دەرباری

---

(۸) کارەکانی. یۆ. س. کارتسۆڤ و پرڤیسۆر یگیازاروڤ، دەربارەی یەزیدییەکان لە نووسینەکانی بەشی قەفقاسی کۆمەڵەی جوگرافیداو لە بەرگی ۱۳، بڵاوکراوەی دووەمدا، بڵاوکراوەتەوە، هەروەها سەیری، یۆ. کارتسۆڤ، حەوت ساڵ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بکە. ۱۹۰٦، لاپەڕە: ۱۸۷، ۱۹۰، وە هەر بۆزانین ئەڵێم: من لە هەڵەبجە کوڕەکەی پزیشکی جەنگ (برۆینسلاف خیمیل)م بینی کە چارەسەری کارتسۆڤی کردبوو، وەئەم کوڕە هەر لەوێ مایەوەو

یەزیدی‌یەکان نووسیووەو تیایا ئەڵێ :ـ سەیری هەندی لە
بەشەکانی ( کتێبی جیلوە ) م کردووە دووای ئەوە ئـەو
بەشانەی کە وەرگێڕراوون ، گومان لە راستیاندا نی‌یە ،
بەلام ( ئەنستاس ماری ) شەرەفی بلاوکردنەوەی ئــەو
ڕاپۆرتە گرنگەی وەرگرت ، بەشەکەی دووایشـی لای
( کارتسۆڤ ) بریتی‌یە لە لێکدانەوەیەکی دووروو نزیکی
ناوەڕۆکی کتێبی دووەمی یەزیدی‌یەکان کە ( مەسحەفی
رەشــــە ) موسوڵمانەکان بەیەزیدی‌یەکان ئەڵێن ( شەیتان
پەرست ) ، بەلام ئێستاو دووای دەرکەوتنی سەرچاوەو
زانیاری تازەی ئــەم بابەتە ئیتر ئــەم (جنێوە )(×) زۆر

---

پـەروەردەیەکی ئیســلامیانەی وەرگرت و وەکـــو
کوردێکی ڕەســـەن هەڵکەوت ، تەنها لـــە ڕەنگی
قژی‌دا جیاوازی لەگەڵ کوردەکاندا هەبوو .

ـ تێبینی ـ ( ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە کە ئەم
کارتسۆڤە ، عەقد کارتسۆڤ نیە ، ئەوەشیان ڕۆژهەلاتناسە
لە کورد ناسی‌دا ـ مارف ـ ) .

(×) ڕەنگە نووسەر مەبەستی لە ( جنێو ) ، ئەوەبێ ، یاخود
وا تێگەیەنرابێ ، کە یەزیدی‌یەکان زۆریان پێناخۆشە
پێیان بڵێ ی ( شەیتان پەرست )و ئەم وشەیە بە جنێو
ئەزانن ، کەچی هەر دووای ئەوە ئەڵێ ( یەزیدی‌یەکان
خۆیان بلاوی ئەکەنەوە کە شەیتان خوایانە ) ، جـــا
ئەگەر خۆیان وا بڵێن ئیتر مەسەلەکە بـۆ بـــە جنێو
ئەزانن و پێیان ناخۆشە .

گوێی نەئەدرایەو هیچ گیروگرفتێکی پێك نەهێنا . لــە ڕاستیشدا یەزیدی یەکان خۆیان بلاوی ئەکەنەوە کە شەیتان خوایانە ، ( مەلەك تاووس ) یاخود ( باوکە تاووس ) . بەڵام وا دەرئەکەوێ کە ئەوە یەکێکە لە ڕواڵەتەکانی خوایەتی . یەزیدیش بە زۆری وا خۆیان دەرئەخەن کە گوایە ( دوو بڕوان ) یاخود ( بڕوا بە دوو هێز ) ، بەڵام ئـەم تیورەش ڕاست نی‌یە چــونکە لــە سەرەتادا خێرو شــەڕ ، بەربەرەکانێ کەری ســەرەکی یەکتری نین ( هرمزو ئەهریمەن ) ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ، هەموو زینـدەوەر لەیەك سەرچاوەیەو ڕواڵەتی ( شەش پەری ) یان ( حەوت پەری )،( باوکە تاووس ئیزائیل ، ئیسرافیل ، تۆرائیل ،... هتد ) هەموویان لەیەك سەرچاوەن ، ئەمانە درووسـت کراوون وەکو دروست کردنی گڕ لە گڕەوەیە ( یاخود ئاگر لـە ئاگر درووست ئەکرێ ) ، وە جیهانی بینراو لـە لایەن ئەم حەوت هێزەوە دروست کراوە ، بێجگە لە ئاگر کە ڕاستەوخۆ خوا درووستی کودووە ، شـەڕیش لە بڕوای یەزیدی‌یەکاندا شتێکی سروشتی نی‌یە . بەڵکو دەرخستنی هەوەسێکی سەربەستەو لــە خواوە دەرئەچێ و دووای ڕێك کەوتنی گشتی کۆتایی دێت ، خێریش بە شێوەیەکی کاتی لە گیانی خوا جیا بۆتەوە . ( باوکە تاووس ) لای خاوەنی ئەم بڕوایە قیبلەی پەرستن‌و ڕێزلێ گرتنە(٩) .

(٩) کتێبە کەي و . واچمان ( کەنیســەو مزگەوتــەکانی ئەرمەنستان‌و کوردستان )،( لایبزیك ، ١٩١٣ ، لاپەڕە ، ٩ - ١٥ ، بەزمانی ئەڵمانی ، گەلێ زانیاری‌و وێنەی پەرستگاکانی تیایە .

هەروەها یەزیدی‌یەکان بڕوایان بە (دۆنادۆن) (تناسخ الأرواح) هەیەو ئاگرو گڕ ئەپەرستن‌و شتی زۆریش حەرام ئەکەن، کاهو، پاقلەو ماسی ناخۆن‌و شتی شین لەبەر ناکەن.... هتد. پیاوی ئایلی خۆیانیان هەیەو ئەمانە رۆحین‌و لەکۆمەڵەی تایبەتیدا رێکخراوون، کەنیسەی خۆیشیانیان هەیە، کەنیسەی سەرەکیشیان، کەنیسە کۆنەکەی مەسیحیەکانە لە (لالش) لە نزیکی موسڵ کە (شێخ عەدی)(١٠) تیا نێژراوە، ئەم پیاوە لەو پیاوانەیە کە پاکی ئاینی یەزیدی‌یەکانی پاراستووە، (کتێبی جیلوە) ئەم دایناوەو لە هەموو شتێك خۆشتر ئەوەیە کە مێژوو نووسە موسوڵمانەکان ئەم پیاوە مێژووی‌یەی کە لە سەدەی دووانزەهەمی زاینی‌دا ژیاوە، بە موسوڵمانێکی رێك‌وپێك‌و چاك دائەنێن‌و وای دانانێن کە لەسەر ئاینێکی تر یاخود بیروڕایەکی تر بووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمانەکان هەر لە ساڵی ١٤١٥ی زاینی دا گۆڕ و مەرقەدەکەیان تێکداو زۆری نەبرد شوێن کەوتووەکانی

---

(١٠) هەر لە ساڵی ١٨٥٦ وە ئیتر دەربارەی یەزیدی‌یەکان زانیاری‌یەکی زۆروو زەبەندە هەیە، بڕوانە (لیرخ) بەرگی یەکەم، لاپەڕە، ٤٧، بەڵام دەربارەی بڕوایان بەشەڕ، بڕوانە (مار). ئەفسانەیەکیش هەیە ئەڵێ:- (مەلەك تاووس) لە شانازی خۆیەوە دەرکەتووەو لە خوا جیا بووەتەوە، هەوەسی نەبووە بەگوێی ئەو کەسە بکات کە دروستی کردووە.

جۆرێکی تر درووستیان کردەوە .

یەزیدی یەکان لە ٢٣ ی ئەیلولی هەموو ساڵێکدا حەووت ڕۆژ بەبۆنەی جەژنێکی ئاینی خۆیانەوە ئاهەنگ ئەگێڕن ، (لایارد) تەنها ئەوروپاییەك بووە کە توانیوویەتی هاوبەشی ئەم ئاهەنگە بکات ، ئەمیش باسی ئاهەنگەکانی شەوو ، نوێژکردنیان لە ژێـــر شەوقی مەشخەڵداو بـــە دەنگی زووڕناوە ئەکات .

لە کۆتایشدا ئەبێ باسی ئەوە بکەین ( مەلەك تاووس ) کەوێنەی تاوسێکە لەناو یەزیدییەکاندا دەورێکی باڵا ـ ئەبینێ (١١) . هەندێ لە زاناکان بڕوایان وایە ، کە پەیوەندی لە نێوان وشەی ( تاووس ) و ناوی بابلی ی کۆن ( تەمووز ) خوای ڕۆژ و گەرمای هاویندا هەیە(١٢) ، هەروەها ئەم زانایانە وائەزانن کە پەیوەندی تر لە نێوان ، یەزیدییەکان و ئاین و بیروبڕوا کۆنەکانی وڵاتی نێوان دوو ڕووبـــار (میزوپۆتامیا) دا هەیە ، ئاشکراشە کە لەسەدەی پانزەهەمی

---

(١١) باسی وێنەیەکی بێهاوتا ( لاشەیەکی برۆنزی وەکو سکەی پارە لێدراوە ) لـــە وتارەکەی ( ئەنستاس ماری )دا هەیە .

(١٢) پرۆفیسۆر ، ( د . آ . خفولسون ) ، یەکەمجار ئەم بڕوایەی بڵاوکردەوە ، بەڵام بەڵگەی ئەوانەی کە ئەم بڕوایە ئەدەنە دوواوە ، ئەوەیە کە یەزیدییەکان لە وەرزی گەرماو (تەمووز) دا هیچ جەژنێکیان نیـــە ، بەڵام ئەمەش بڕیاری هیچ شتێك نادات .

زایلی‌دا دانیشتووانی شاری (حەڕان)(لە نزیك ئۆرفەوە) خـوای مانگ (سـین) یان ئەپەرست کە ئەمە لای یەزیدی‌یەکان (شێخ سین)ـە(١٣) .

ئیتر مەسەلەکە هەر چۆن بێت ، یەزیدی بڕوایەکەو گەلێ توخمی سەرەتایی تیا کۆبۆتەوە روونترین شتیش بۆ ئەمە ، ئەو ڕاو تێروانینانەیە لە دروست بوونی شەڕدا ، سەر ژمێری‌یەکان وا ئەگەیەنن کە ژمارەی یەزیدی‌یەکان لە تورکیادا سەد هەزار کەس ، (سنجار : موسڵ ، هەکاری). وەکو سەر ژمێری‌یەکانی ساڵی ١٩١٠ دەری خستووە لای ئێمەش لە قەفقاسدا /٢٥/ هەزار یەزیدی هەیە(١٤) .

---

(١٣) تۆرایێف ، مێژووی رۆژهەڵاتی کۆن ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ، ٢٨ ، ئەتوانرێ وا دابنرێ کە هاوبەشی‌یەك لە نێوان یەزیدی‌یەکانو سـوبەکانی ئێستادا هەیە ، (بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە شۆڕینەوە هەبێت) ، بڕوانە ، آ.آ . ئارموف ، عێراقی عەرەبی ، ١٩١٢ ، لاپەڕە ، ٢٢٤ ـ ٢٦٠ ، بەزمانی رووسی .

(١٤) گومانی تێدانی‌یە کە ژمارەی یەزیدی‌یەکان لە کۆندا زۆر لەم ژمارەیە زۆرتر بووە ، لە شەرەف نامـەدا دەربارەی ئەمیرە بەناوبانگەکانی جەزیرە نووسراوە کە(ئەوانە خۆیان بەستووە بەخووڕەوشتی بیروبڕوای یەزیدی‌یـە)وە ، وەرگێڕراوەکەی ، بەرگـی دووەم ، لاپەڕە ، ١٤٢ ، هۆزی سیپکی ، کە هەندێکیانم لە ساڵی ١٨٥٣ ـ ١٨٥٦دا لە دەوروپشتی بایەزیددا دی ، ئەمانە

←---

ئەم ئاینەکەی تر ئاینی (عەلی ئیلاهی)یە (١٥) ، ئاینێکی کوردی تەواوەو بە تەواوی لێی نەکۆڵراوەتەوە .

ئەوانەی کە بەسادەییەوە سەیری شتەکان ئەکەن ئەڵێن ئەم مەسەلەیە لە هاتنی خەلیفەی چـــوارەم (عەلی) یەوە دەست پێ ئەکات ، ئەمانـــە بیروڕای موسوڵمانەکان لە دروست بووندا ئەگێڕنەوەواوە ، مەسەلەکە لای ئەمانە وەکو ( دۆنادۆن ـ تناسخ الأرواح ) وایە ، ئاشکرایـە ئەمەش لای ئەو موسوڵمانانەی ناوبانگی باشیان هەیـــەو

---

لـــەو یەزیدیانە بوون کە موسوڵمان بوو بوون ( ئیفریانۆف ) لە ئێرانیش دا تەنها دێیەکی یەزیدی لـە ئەمارەتی ( ماکۆ ) دا مابووەوە کە دێیەی ( جەبارلو ) بوو ( نزیکەی ٢٥ ماڵێك ئەبوون ) هەمدیسان سەیری ( ڕاپۆرتی گەشتی ماکۆ لە ، ١٩٠٥دا ، لاپەڕە ، ٢٣ ـ ٢٤ ، بکە .

(١٥) عەلی ئیلاهییەکان بەخۆیان ئەڵێن ( ئەهلی حـەق ) کۆمەڵێکیان لای ئێمە لە رووسیا لە ناوچـەی ئەلیزابێث پول لەناوچەی قارسدا ئەژین ، بەڵام لە قەفقاسدا بەشی زۆریان بە کوردی رەسەن دانانرێن بەڵکو وەکو ئاینێکی تایبەتی ، هەروەها لـــە نەخشە رەسمیەکانیشـدا وەکو ئاینێکی تایبەتی نیشانەیان بۆ دائەنرێ ، بڕوانـە نووسینەکانی بەشی قەفقاسی کۆمەڵەی جوگرافی ١٨٩٧ ، کتێبی نوزدەهەم ، هەروەهـا ڕۆژ ژمێـــری قەفقاسی ساڵی ، ١٩٠٧ .

بە تەواوی موسوڵمانن دراوەتە دوواوە(١٦) . بەڵام ئەوەی پەیوەنـدی بەڕواڵـەتی ئاشـکرای بیروڕای (عـەلی ئیلاهی یەکانەوە) هەبێت ، ئەوەیە کە خوایەتی لە جیهاندا حەوت جار دەرئەکەوێ وەجارێك لەعەلی‌دا دەرکەوتووە، لەگەڵ هەموو خوایەکیشدا چوار پەری دەرئـەکەوون ، کە رەوشتە گشتی‌یەکانی خوایان هەیـە ، وە (عـەلی ئیلاهی‌یەکان) وا ئەزانن کە محەمـەدی پێغەمبەر یەکێك بووە لەو پەریانەی کە لەگەڵ عەلی دا هاتوون(×) ، بەڵام (ئاشکراکردنی نهێنی‌یەکان) لـە سـەردەمی عـەلی ئیلاهی‌یەکاندا تەواو نەبووە . بەڵکو دووای ئەو سەردەمە بووە ، لە سەردەمی باباخۆشێن‌و سوڵتان ئەسحەقدا رووی داوە ، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە خوایەتی لـەلای ئەمانە دراوەتە سـەرۆکی پەری‌یەکان کە لـەگەڵیاندا بووە(١٧) .

عەلی ئیلاهی یەکان بڕوایان بە دۆنادۆن (تناسخ الأرواح)

---

(١٦) بۆ نموونە بڕوانە (بستان السياحه) لاپەڕە ، ٣٧ .

(×) وائەزانم لێرەدا نووسەر مەسەلەی حەقەکان‌و شیعەکانی تێکەڵاو کردووە ، چونکە ئـەو شتانەی کە باسـی ئەکات تێکەڵاوە لە بیروبڕوای حەقەکان و شیعەو یەزیدیەکانیش .

(١٧) لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسماعیلی‌دا بەرانبەریان بکە کە خوا بە (پاشای گەورە) یاخود (عەقڵی هۆشیار) ئەزانن ، نەك بەخوایەتی خۆی .

هەیەو ئەڵێن مردن وەکو ( نوقم بوونی مراوی لە ئاوداوایە ) لە شوێنێکدا وون ئەبێ و ، جارێکی تر لە شوێنێکی تردا دەرئەکەوێتەوە لە شتە سەیرەکانی ڕەوشتیان ( برایەتیە ) ، (یەکێك ئەکەن بە برای خۆیان کە لە راستیدا برای راستی نی یە ) ، هەروەها لە رەوشتەکانیان کە دەورێکی گرنگی هەیە ، دابەش کردنی نانێکی تایبەتی یە بە شێوەیەکی تایبەتی لەگەڵ گۆشتی سوورەوە کراودا ، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هەندێکیان وابزانن گوایە ئەم رەوشتە لە بیروباوەڕی گاورە کۆنەکانەوە وەرگیراوە ، کە ئەوان کاتی خۆی نانو گۆشتیان بەخشیوەتەوە ، بەڵام من وا ئەزانم ئەمە راست نیە ، چونکە باوەڕی (عەلی ئیلاهی ) بە هەموو شێوەو رێرەوە گشتی یەکانی یەوە لە هیچ شتێکدا لەگەڵ گاووری دا لەیەك ناچن . ( عەلی ئیلاهی یەکان ) لەگەڵ موسوڵمانەکاندا لە دوژمنایەتیەکی بەردەوامـــدا ئەژین ، قزڵباشەکان کە ئەم بیروباوەڕەیان هەیەو لە هەموو ناوچەکانی دەرســیمدا ئەژین ســەر بــۆ تــورکەکان دانانەوێنن(۱۸) ، بەڵام هەر ئەو (عەلی ئیلاهی یانە ) ، کە

---

(۱۸) بیروباوەڕی ( عەلی ئیلاهی ) لە ئێرانو تورکیاداو لەناو گەلەکانی تریشدا بڵاوبۆتەوە و لە ئاسیای بچـوکدا تورکمان زۆر هەیـە بڕوایان پێ یەتی ، لە ئێرانیشدا زۆرن ، بەتایبەتی لە ناوچەی ئازربایجاندا ، وە ئەڵێن لە ســەردەمی فەرمانڕەوایەتی ( مەڕی رەش ) داو لە سەدەی پانزەهەمدا ژمارەیان زۆر تر بووە ؛ لەو کاتەدا کە سەرۆکەکانیان بانگ کراوون بۆ تورکیا، بڕوانە ، د . ف . بارتول ) تورکیاو ئیسلامو گاوور ، گۆڤاری مانگانە ، ١٥١٥ ، ژمارەی دووەم .

له توركیا ئەژین لەگەڵ ئەم رایەدانو قزڵباشەکان بــە هاوبیری خۆیانیان دائەنێن ، تەنانەت ئەو نــاوە خــۆی فارسەکان بۆ گاڵتە پێ‌کردنو پێ‌رابووارد‌نیان بەکاریان هێناوە ( ئەو ناوە بەتورکی مانای ـ سەرسوورە ـ واتــە کڵاوی سوری لەسەر کردووە ـ مارف ـ ) واش ئەزانرێ کە ئەم بیروباوەڕە لە ئاسیای بچوکدا بڵاوبۆتەوەو بــە شێوەیەکی راستەوخۆ لە ئێرانەوە هاتووە . لەو شتە سەیرانەی کە قزڵباشەکانی توركیا بڕوایان پێ‌یەتی ، ئەوەیە کەوا ئەزانن خوا بۆیە هاتۆتە ســـەر زەوی کە ئیش بکات . ئەمانە وائەزانن عەلی جەنگاوەرە ( مەبەستیان لــە ئیمامی عەلی‌یە ـ مارف ـ ) ، ( شیرە گەورەکەی داوە بەرووسیاو نیشانە سەوزەکەشی داوە بە ئینگلتەرەو ئیتر ئــەم دووانە تورکەکان لەناو دەبەن ) .

گەڕۆکە زانا رووسەکان لە ساڵی ۱۹۱۳ داو لەویلایەتی سیواس لە هەندێ خەڵکی خاوەنی ئــەم بیروباوەڕەیان بیستووە(۱۹) ، کە گوایە لە ساڵانی سی‌یەکاندا یاخــود ( ۱۳۳۰ کۆچی ) عەلی‌یەکی تر دەرئەکەوێ ، خەڵکیش خۆیان ئامادە کردبوو بۆ پێشوازی هاتنی خوایەکی تر ،

(۱۹) قونسوڵی فەرەنسی ( گریلار ) ، ئەفسانەیەکی وەکو ئەمەی بیستووە ، بڕوانــە تێبینی‌یەکانی دەربارەی یەزیدی‌یەکانی ڕووسیا ، ئەمیریانۆف ، دەنگوباسی بارەگای سەرکردایەتی ناوچەی قەفقاس ، ۱۹۰۵ ، ژمارە ، ۷ ـ ۸ ، هەروەها ژمارە ، ۱۹ ، ساڵی ۱۹۰۷ ، بە زمانی رووسی .

له رێکەوتە خۆشەکانیش وەکو لە پێشەوە باسمان کرد بەتەواوی شەڕ لە کۆتایی ساڵی ١٣٣٠ی کۆچیدا دەستی پێ کرد(٢٠) .

( عەلی ئیلاهی یەکان ) ئەدەبێکی نووسراویان بە شێوە زمانی گۆرانی هەیە ، بەوە بەختەوەر بووم کە بۆ یەکەمجار دەستنووسەکەیم دەست کەووت و یەکێکیان چاپکرا کە کتێبی ( سەرنجام )(٢١) بوو وە لەکاتی گەشتە دووایییەکەمدا و لە ساڵی ١٩١٤ دا تووانیم سەرێك بدەم لە قیبلەیەکی پیرۆزی ( عەلی ئیلاهی یەکان ) لە دێیی ( پیر دێوەر ) لە هەوورامان کە ئەکەوێتە ناو شاخو لوتکەو بەردێکی سەختەوە ، لە رووی دیمەنی سروشتی یەوە ئەم ناوچەیە بە شوێنێکی جوانو راراوە دائەنرێت ، بەلام گۆشەکەی تر کە ئەکەوێتە رۆژئاوای زەهاوەوەو گۆڕی ( بابا یادگار )ی(٢٢) لێیە ، لەم رووەوە زۆر گرنگترە ، وە لەپێشمنەوە دوو گەڕۆکی رووسی تر کە ١ بارون

(٢٠) ف . آ . گوردلیڤسکی ، خشتە رووسی یەکان ، ٢٣ ، تشرینی یەکەم ، ١٩١٤ ، هەمان سەرچاوە ، ١٦ی کانوونی دووەم ١٩١٥ ، بە زمانی رووسی .

(٢١) ف . مینۆرسکی ، بابەت بۆ لێکۆڵینەوەی باوەڕی ( ئەهلی حەق ) یاخود (عەلی ئیلاهی) ئێرانی ، مۆسکۆ ، ١٩١١ ، بەشی یەکەم ، بەزمانی رووسی .

(٢٢) بۆ وێنەی گۆڕەکەی (سەیری ئۆسکارمان بکە ) لە رۆژنامەی وێنەداردا ، ٣٠ ، نیسانی ١٩٠٨ ، ژمارە ، ٣٣٨٣ ، بەزمانی ئەڵمانی .

بودی )(٢٣) و ( عەڤید چیریکوف ) بوون سـەریان لەم ناوچەیە داوە .

من تووانیم کە سەیری هەموو نهێنیی و شـاراوەکانی ئەم باوەڕە لە گۆشە جیاجیاکانی ( بابا یادگار ) دا بکەم، چاکەش لەمەدا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو پیاوە لێپرسراوانەی (عەلی ئیلاهی یەکان ) ئەوانەی کە بڕوایان پێ کردمو هیچ داوایەکیان نەدامە دوواوە .

هەمووشتێك لەم خاکەدا یادگاری خۆی هەیە ، بۆیان باس کردم کە لە یەکێك لە کۆبوونەوەکانی ئەم (عەلی ئیلاهی یانە ) دا زیکرو لە هۆش خۆچوونی دەروێشێکیان گەیشتۆتە رادەیەك کە لە بەردەم گۆڕەکەوە خۆی فڕێ- داوەتە چەمەکە بــۆ خوارەوەو بانگی کردووە ، ( هاتم بۆ لات ئەی بابا یادگار ، وەرم بگرە ) ، ئەم هەوەســە بەکوڵە وەرگەڕاو بوو بە کارەسات ، بینەرانی رووداوەکە وتوویانە دەروێشەکە پارچە پارچە بووەو مردووە .

دێوانەکانیان ئەوپەڕی لوتفیان لەگەڵ ئێمەدا نوواند. تەنانەت بۆ یادگار مۆمێکی سەر گۆڕەکەو پیاڵەیەك ئاوی کانیە پیرۆزەکە ( کەسلان ) یان پێشکەش کردم .

---

(٢٣) بلاوکراوەی ( نامەخانەی خوێندنــەوە) ، ١٨٥٤ ، بەرگی ، ١٢٤ ، بەشی سێیەم ، یادداشتی ( الباروف ، ك . بودی ) ئەندامی کۆمەڵەی جوگرافی رووسیو سکرتێری یەکەمی لیژنەی ئیمپراتۆرییەتی رووسی لە تاران .

گەشتەکەم زۆر خۆشبو ، ئەو شتانەی لەناخو هەستمدا جێ‌ماوون ، هەتا ماووم لە بیرم ناچنەوە ، ئەوەتا لەگەڵ ئەوەشدا کەوا ئەم بەشەم تەواو کرد ، ناتوانم پەرەگرافێك لە یادگارەکانی رۆژانەی خۆم نەنووسم .

« رۆژی ٢١ی نیسانی ١٩١٤ یەو ئاسمان سافو مانگەشەوە ، شوێنەواری قەڵا کۆنە رووخاوەکان لەسەر چیا نزیکەکاندا بڵاوبوونەتەوە ، سەر لوتکەکان بەسەر دۆڵی چڕوپڕ لە دارستانو درەختی جوانو بەرزدا ئەیان روانی ، پەڵە سنەوبەرە نۆخەکانی دەوروپشتی لوتکە سپی‌یەکان ( هەر وەکو ـ بۆدی ـ بە شێوەیەکی جوان ) باسی کرد ـ بوون لە هێلکە کەو ئەچوون ، بەڵام زۆر گەورە بێتو لە هێلانەیەکی سەوزی چڕوپڕدا دانرابێت ، زیقەزیقی پەلەوەرەکان کە لە قوڵایی دڵیانەوە دەرئەهات ، لە ویردی هەمیشەیی دەروێشەکان ئەچوو کە ئەیانوت ( هوو، هوو ) زەنگی وڵاخەکەم لێ ی ئەدا ، پاسەوانە قازاقیەکەش گۆرانی ( کووبانی )(٢٤) ئەوت .

بەڕاستی خەوبینینێکی خۆشبوو ، ١٢ ساڵ چاوەروانیم کرد ، لە کۆتاییشدا رێکەوت پاڵی پێوەنام بۆ ئەم ناوچە سەیرە ، هەمیشە بیرم لە رابووردوو ئەکردەوەو هەستم

---

(٢٤) گۆبان :ـ ناوی رووبارێکە لە رووسیا ، ئەرژێتە دەریای رەشەوە ، قازاقەکان کە بەنەتەوەیەکی تایبەتی دائەنرێنو بە رووسی قسە ئەکەن ، لەوێدا ئەژینو هەندێکیش بەنەتەوەیەکی رووسییان دائەنێن ـ مارف ـ .

نزیکی زێوانە کۆنەکانی ئەو گۆڕە پیرۆزە ئەبووەوە ، کە ئەم خزمەت گوزاری‌یە پیرۆزەیان لە وەچەوە پشتاو پشت بۆ ماوەتەوەو هەموو ژیانیان لــە کۆشی پیرۆزی ئــەو گۆڕانەدا بردۆتەسەر(×) ، چاوەروانی ئـەو ســەعاتەیان ئەکرد کە بە تاتەبەردێکی مەڕمەڕو لــە سێبەری ئــەو پیاوانەدا کە باوباپیریان بینیوونی ، دایان ئەپۆشن ، کە

---

(×) بەڕای من ئەو ناوچــەیەی نووسەر باســـی ئەکات ناوچەی ( هاوار ) ـە لە قەزای هەڵەبجەی سەر بــە پارێزگای سلێمانی ، چونکە ئەو شوێنەوارو ئاوو هەواو سروشتەی باسی ئەکات کتومت لەو ناوچەیە ئەچێت کە دانیشتوانی دێی ( هاوار ) خۆی ئاینێکی تایبەتی خۆیان هەیەو تاکو ئێستاش لەسەری ماوون و پاراستوویانەو لە ناوچەی هەوراماندا تەنها ئــەو ناوچەیە هەیە ( یان بڵێین تەنها ئەو دێیە هەیە ) کە بێجگە لــە ئیسلام ئاینێکی تریان هەبێت ، گومانیشی تێدانی‌یــە کە نووسەر لە گەشتەکەیدا بۆ کوردستان گەیشتۆتە شاری هەڵەبجەو ( لەوێڵەو بیارەی هەورامان ) و هەر لــە بەشەکانی پێشوی ئەم کتێبەدا باسی ئــەوە ئەکات کە ئەم ناوچانەی دیوەو ئەو دێیەش بەناوی ( پیر دێوەر ) کە نووسەر ئەڵێ دیومە بەڕای من هەر دێی ( هاوار ) ـە و وەکو خۆیشی ئەڵێ و راست ئەکات ( بابا یادگار ) لە هەورامانی کوردستانی ئێرانە .

لەوانەشە لە خزمەتی کەسی نهێنیو خاوەن تەلیسم ( بابا یادگار ) خۆیدا بووبن(×) .

---

(×) هەر خوێنەرێکی شارەزای ئاینی کوردەواری دووای خوێندنەوەی ئـەم بەشـە ئەزانێ کە مینۆرسـکی شارەزاییەکی باشی لە ئاینی کوردەکاندا پـەیـدا نەکردووەو ئەوەش تێ ی گەیاندوە هەر شارەزانە بووە. چونکە کورد خۆی لە پێش هاتنی ئیسلامدا بێجگە لەو ئاینانەی کە مینۆرسکی باسیان ئەکات ئاینێکی سەرەکیان هەبووە کە ئاینی (زەردەشـتە) و کتێبی پیرۆزی ( ئاڤێستا ) یان هەبووە کە نووسەر خۆی لە بەشی چوارەمی ( زمانو ئەدەبدا ) باسی ئەکات ، کەچی لە بەشی ئاییندا بەهیچ جۆرێ باسـی ئـەم ئاینەی نەکردووەو خۆ ئەگەر بشڵێ ی هـەر دووای هاتنی ئاینی ئیسلامیش ئیتر بەشی زۆری کورد (وەك مینۆرسکی خۆی لە سەرەتای ئەم بەشـەدا باسـی ئەکات ) موسوڵمان بوون و بیروباوەڕی یەزیدی و ئەهلی حەقیش (عەلی ئیلاهی ) بەوشێوەیە نەبوون کە ئەم باسیان ئەکاتو بەتایبەتی لەکاتی هاتنی نووسەردا بۆ کوردستان ئەو بایەخەیان نەبووە .

## ڕەوشـــتی کـــورد

سێ ڕواڵەتی گرنگ هەن کە کاریان کردۆتە سەر و ئەکەنە سەر لایەنەکانی خووڕەوشتی کورد ، ژیـانـــی میرنشینە بچکۆلەکانی کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا(١)، یاسای تیرەگەری هـــۆزە کوردەکانو لە دووایبشدا بـە

(١) من وانازانم کە وشەی (دەرەبەگ) بەسەر هـەموو ئەو میرنشینانەدا بسەپێت کە لە ڕاستیدا لە خاوەن دۆڵەکانی ناو چیاکانی تورکیای کۆن پێك هاتوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەنـــدێ ناوچەدا وەکـــو هەکاریو بۆتانو سلێمانیو میرنشینی گەورە گەورە دروست بوونو دەستیان بەسەر گەلێ ناوچەی فراواندا گرتووە کە لەوەوپێش سەربەوان نەبوون ، ئـەوەی شایانی باسە ئەوەیە کـە فەرمانڕەوای کوردســـتان ( ئەردەڵان ) لە وڵاتی فارســدا نازناوی ( والی ) هەبووە ، کە بە تەواوی سەربەخۆ بووە ، وە لەگەڵ والیەکانی گورجیاو لوڕستانو عەرەبستاندا هاوبەشی ئاهەنگەکانی دانانی شاهەنشایان لەسەر تەخت کردووەو لەو کاتەدا کاسەیەکی ئەڵماسی بەدەستەوە بووە .

کارهێنانی کورد لــه لایەن تورکەکانەوە بۆ مەبەستی سیاسی رووت. وا لەمەودووا هەوڵ ئەدەین ، باسی ئەم مەسەلانە بکەین :-

( ئابوڤیان )(٢) بە کوردەکان ئەڵێ ( ســوارەکانی رۆژهەڵات ) بێگومان تاکو ئێستاش ئەم پێناسـەیە مانای خۆی پاراستووە ، بەتایبەتی ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندی بەچینی سەرەوەی کوردەکانەوە هەبێت ( سەرۆك هۆزو دەرەبەگەکان)(×). هەروەها بە زانستیو واقیعیش لەگەڵ ژیانی سەدەکانی ناوەڕاستی کوردستانـدا ئەچەسپێت ،

---

(٢) لەمەودووا تێکستێکی تەواوی ئــەم نووســەرە کە دەربارەی کوردەکان نووسیوویەتی ئەنووسین .

(×) مەرج نی یە ســوارچاکی لێهاتنو پیاوەتی لەنــاو کوردەواریدا تەنها پەیوەندی بە سەرۆك هۆزو دەرەبەگەکانەوە بێت ، بەڵکو ئەم مەسەلەیە یەکێکە لەهەرە رواڵەتە بەرزەکانی ناو ژیانی کوردەواریو هەموو چینەکانی گەلی کورد ئەگرێتەوەو ، نەتەوەی کورد هەر لــە سەرەتای دروست بوونی مێژووی نەتەوایەتی یەوە شانازی بەم مەسەلەیەوە کردووە . جا بۆ زیاتر شارەزا بوون لەم مەسەلەیە ئەتووانی سەیری ئەم ســەرچاوانە بـکــەیــت :-

(١) کتێبی ( سوارچاکی لە لاوکی کوردەواری ) دا کاك محمد کریم شریف .

(٢) گۆڤاری بەیان ژمارە (٥٧) لاپەڕە (٢٦) ( سوارچاکی لە ئەدەبی کوردی ) دا ، مامۆستا عبدالرزاق بیمار .

دیارە کوردەکان لە (سوارە دەموچاو مۆنەکانی) ئەورروپا ناکەن، ئەمە وەسفێکە مانای ئیهانەو گاڵتەکردنی تیایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئایا ئەوە رواڵەتی کەسایەتی گەورەنیە

سوارچاکی لە کوردەواری‌یدا تاکو ئەمڕۆش هەر باوی‌یەتی

کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، مرۆڤ ئەو وەجاغزادەیە بێت کە شانازی بە باوباپیری خۆیەوە بکات، ئەو باوباپیرانەی کە خەڵکانێکی زۆریان بەخێو کردووە، کورد حەز لە گۆڕانی راوچیەتی ئەکات، هەرچی شتێکی بە بەرچاودا تێ‌پەڕبووبێ باجی لێ‌سەندوە. هیچ بەلایەوە گرنگ نی‌یە کە لەشەوی تاریکیدا بچێتە دەرەوەو لە شوێنەکەی خۆی دووربکەوێتەوەو بچێت بۆ شاری گەورە، هەوڵ ئەدات خەڵکی خراپ نەهێڵێ و دەستیان

بەسەردا بگرێ ، خۆ ئەگەر هەلیشی بۆ هەڵکەوێ ئەوا لـــە تـالاّن کردنی گاورە ( بێزەنتیە ) لاوازەکاندا هیچ ناوەستێت ، ئەو جیاوازی‌یانەی کە لە کوردستاندا باسـمان کردن‌و سەردانەنەواندنی کورد بـۆ هەر دوو دەوڵەتی سەربەخۆی تورك‌و فارس‌و بوونی باری ئابـووری زۆر چاکیان‌و هەروەها پەیوەندی سـەرۆکەکان بەجووتیارە- کانەوە ، ئەمانە هەموویان هۆی راستەوخۆ بوون بۆ پێك هێنانی ئەم جۆرە دەرەبەگایەتی‌یە تایبەتیە .

وە هەر بۆ نموونەش ئەبێ دەست بۆ مەسەلەی شانازی کوردەکان بەرەگەزو رەسەنایەتی خۆیانەوە رابکێشین ، وە لێرەدا ئەمەوێ کە نهێنی‌یەکی بچکۆلە دەربخەم .کە مرۆڤ بەهۆیەوە ئەتوانێ خۆشی‌و شادی بخاتە هەستیانەوە ، لە ڕۆژانی گەشتەکەمدا لیســتەیەکی وەچەی ســـەرۆك هۆزەکانم ئامادە کردوو لەگەڵیشیانا کۆبوومەوە ، هەوڵم‌دا کە پەیوەندی ئامۆزا یاخود ئامۆزازایان لەگەڵ یەکتری‌دا بـــۆ روون بکەمـەوە . وە ئـەوە بڵێین باپیرئاغا ئامۆزای بایز ئاغا یاخود پیرۆت ئاغایە ؛ ئەمەش بووە هۆی خۆشی‌و کامەرانی‌یەکی گەورەی وا کە لێدووان‌و قسـەلێ‌کردنی لە هەمولایەکەوە بە شێوەیەك دەستی پێ‌کرد ئەوپەڕی نەبێتەوە ! .

لە کوردستاندا زۆر لە نەخێندەوارەکان هەن کە (١٠) تا (١٥) ناوی باو باپیری خۆیانیان لەبەرە .

لە کوردستاندا گەلێ لایەنی زۆری تری ژیان هەیە ، وەکو خۆشی‌و فراوانی کامەرانی لە قەلاّی سەرۆکە -

کانیان‌دا ، لێره‌دا هه‌وڵ ئه‌ده‌م باسی ژیانی هاوڕێی بەدبەختم (سەردارِ موکری) بکەم کە تورکەکان لە

هونەری کوردیو خۆشیو کامەرانی ئەم سەردەمەی ژیانی کوردەواری

کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ داو لە ڕۆژانی داگیرکردنی تەوریزدا کوشتیان .

لەساڵی ١٩١١ دا (سەردار) دەعوەتی کردین بۆ

دیوەخانەکەی خۆی لە شاری هۆکان ، جـا هەر لەگەڵ نزیکی شوێنەکە بووینەوە ئیتر هەر پێنج دەقیقەیەك کۆمەڵێ سووار پێشوازی ئەکردین ، دووای ئـەوە کوڕەکەی سەردار هات‌و پێشـوازی لێ کردین ، خزمـەت‌کار و جووتیارەکان خواردەمەنی زۆر جۆراوجۆریان هەڵگرت‌و هێنایان بۆ ناو باغچەکەیان کە بە دەوروپشتی حەوزێکدا چەند خێوەتێك هەڵدرابوون . نانی نیوەڕمان خواردوو ، دووای ئەوە چایی‌و جارێکی‌تر خواردن‌و هـەمووشـی لەگەڵ ئاوازی گۆرانی‌و مۆسیقادا بوو ، ئەم دەعوەتەش تەنها بۆ ئێمە نەبوو ، بەڵکو قازانێکی گەورە برنجیشیان ئامادە کردبوو بۆ خزمەت‌کارەکان . وە هەرگیز ئەو دوو ماسی‌یە گەورە قەڵەوەم لەبیرناچێتەوە کە بەتایبەتی بەم بۆنەیەوە راوویان کردبوون‌و .... هتد .

سەخاوەتی (سەردار موکری) وای لە دراوسێ‌کانی کرەبوو کە لە هەموو لایەکەوە رووی تێبکەن‌و بەکۆمەڵی گەورە گەورە ئەهاتن بۆ لای‌و ئەویش ماوەیەکی دووررو درێژ میوانداری ئەکردن‌و ئەوانیش ئەیانزانی کە چوونە لای رێزیان لێ ئەگرێ‌و خۆشی ئەوێن . من وا نازانم کە بەشی زۆری کوردەکانی تورکیا ئـەو خوورەوشـتەی موکری‌یەکانیان هەبێت .

جیاوازی جوگرافی‌و سـیاسی‌و کۆچ کردنی لێرەو لەوێ لەژێر پاساو نەریتێکی لەگۆڕاوداو ژیانی بەیەکەوە

بەستراوی پەیوەندی عەشایەری پتەووای کردبوو کە ببێتە هۆی نەگۆڕانو پێش نەکەوتنی هەستی کۆمەلایەتی فراوان لەناو کوردەکاندا .

زۆر کەم لە دێی گەورەو شارەکاندا کۆئەبنەوە (لێرەدا ئەبێ ئەوە بزانرێ کە لەم قسەیەدا مەبەست لە هۆزە کۆچەری یەکانە ـ مارف ـ ) . بۆ ئەوەشی کە لە ڕۆحی کورد بگەین ، ئەبێ سەیری هەموو شتێك لە تێڕوانینی ئەو تەنها شانەیەوە بکەین ( الخلیة الوحیدة )(×) کە بیری خێرو شەڕی لێوە دروست ئەبێ ، کوردەکان دەربارەی خێزانو هۆز هەستێکی زۆر بەهێزیان هەیەو ، ئەم هەستەیان لە هەستیان بەرانبەر مرۆڤایەتی بەهێزترە ، یاخود برایەتی یەکی بنیات نراو لەسەر ئایین ، یان هەستی نەتەوایەتی فراوان .

لە هەرچی شوێنێکدا لایان بدایە وامان ئەزانی خوو رەوشتو نەریتی کۆمەلایەتیو یاسای میری دەووری داووینو وا بەشوێنمانەوە بۆ پارێزگاری ئاسایش ، بەلام ئەی ئەو کوردانەی کە لە ژیانی راستیاندا لەژێر رکێفی هەردوو دەولەتی تورکیو فارسی لاوازدانین ، ئەبێ متمانە بکەنە سەرکێ ؟ . هێزو یارمەتی نێوان خۆیان تەنها شتێکن کە شیاوی ئەوەبن دەستیان پێوەبگرنو متمانەیان بکەنە سەر . تەنها پیاوێكو تەنها خێزانێك ناتوانێ لە پێناوی مانەوەدا تێ بکۆشێ ، ئەگەر لە رێگای عەشیرەتەکەیەوە

---

(×) لێرەدا نووسەر مەبەستی لە خێزانو عەشرەتایەتی کوردەواری یە .

نەبێ ! . کوردیش تەنها لەوەدا بەرگری بەدی ئەکات ، بەم جۆرە لەوشتەوە عەشرەت پەرستیو حەق کردنەوەو ماف سەندنەوەیان تیا دروست بووە . وەکوردەکان لە شەڕەکانی ئەم دووایییەی تورکەکاندا بەوپەڕی پیاوەتیو لێهاتنی بێهاوتاوە بەرگرییان لە هۆزەکانیان کردووە .

بەڵام دەربارەی هەڵوێستی کوردەکان ، وەکو هۆیەکی یارمەتیدەری هێزەکانی تورك گەلێ زانیاری هەیە (بڕوانە جەنەڕال ئەمیریانۆف ) ، بەشی زۆریشیان لە بەرژەوەندی ئەو کوردانەنییە کە لەسەرەتادا بەرگرییان کردووە ، بەڵام بەخێرایی هەوڵی هەڵهاتنیان داوە ، تەنها دانیشتووە ئاسـاییەکانیان تاڵان نەکرد ، بەڵکـو تەنانەت لەکاتی پاشەکشێدا هێزەکانی تورکیشیان تاڵان کرد ، وە ئەبێ ئەوە بزانین کە کوردەکان رۆژێك لە رۆژان هەسـتی نیشتمانیی تورکییان نەبووەو ناشیانبێ ( یاخود هەستی نیشتمان پەروەری تورکی ـ مارف ـ ) .

یەزدان شیر بەتەواوی لە رۆژانی شـەڕی قـرمدا هەڵساوە ، لە کاتێکدا بەشی هەرەزۆری کوردەکان لە ساڵی ۱۸۷۷دا لە دەرەوەی ناوچەکانی خۆیاندا شەڕیان ئەکرد ، سەربازەکانی کورد بەرەو روخاندن ئەچوون ، سەرەڕای هەوڵی شێخە ئایینیەکانیش . بەڵام سەرتیپەکەیان فائق پاشا ( کەلەم دووایییەدا بە تاوانباری لە بەردەمی دادگادا وەستا ) لە داخی ئەنجامی ئەو کوردانەی سەر- بەخۆی بوون تووشی رەشبینیو نائومێدی بوو بوو ، لە کۆتاییدا من وا ئەزانم کە کوردەکان لەم شەڕەی ئێستادا

( شەڕی یەکەمی جیهانی ـ مارف ـ ) چارەنووسی خۆیان بـە ( تورکی تازە ـ الاتراك الفتاة )(٣) ـەوە بەسـتەوە ( ئینقلابیەکان ـ مارف ـ ) . وە بـۆ ئەوەی شێوەیەکی پێچەوانەی ئەوەی سەرەوە بـدەین بەدەستەوە ئەتوانین یەکەمجار دەست بۆ چیوۆکێکی کۆنی گەڕۆکی فەرەنسی ( پۆژۆلات )(٤) رابکێشین .

( لە ساڵی ١٨٣٧داو لە رۆژانی هێرشـەکەی حافظ پاشادا سەرەك هۆزێکی تەمەن (٣٠) ساڵە بەدیل ئەگرن ، زۆر جوان ئەبێ ، زۆر بەهێزانە کاروو بار ئەگرێتە دەستی خۆی ، شانازی بە پیاوەکانی‌یەوە کردووە ، وتوویـەتی من بەهیچ جۆرێك رازی‌نابم بەگێکی تری کورد سەرۆکی ئەم خەڵکانە بێت کە هیچ پەیوەندی‌یەکی پێیانەوە نەبێت ، بەوپەڕی شانازی‌یەوە ئەم قسەیەی دووبارە کردۆتەوە دوو

---

(٣) لەوانەیە کە تێگەیشتنەکانی ئایین وا لە کوردەکان بکەن کە هاوبەشی جەنگ بکەن ، بەڵام ئارادەیەك هیچ نەبێ کە پارێزگاری زەوی‌و زارو کێڵگەکانی خۆیان بکەن ، لە کاتێکدا فەرمانڕەوایەتی تازە هەوڵ ئەدات داگیریان بکات ، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە جەنگی ١٨٢٦ ـ ١٨٢٧ وە بێت ، ئەمیریانۆف بـە راستی‌یەوە ئەڵێ (کوردەکان بەرگری‌یان لە سەرداری ئەریڤان نەکردووە ) ، بەڵکو بەرگری‌یان لەسەربەستی نیشتمانەکەیان کردووە .

(٤) بڕوانە : لیرخ ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ، ٣٠ .

ڕۆژی تەواو هەوڵیان لەگەڵدادەوە ، بەڵام ئەو ڕای خۆی نەگۆڕیوەو ڕازی نەبووە کە پیاوەکانی بـــەجێ بهێڵێ و لەکاتی دیلیەکەیدا بەوپەڕی لەسەرخۆییەوە سەبیلەکەی کێشاوەو لە ڕۆژی سێیەمدا پاشـــا زۆردارەکە فەرمان ئەدات کە بیخەنە قابلەمەیەك ئاوی گەرمەوە ، بـــەڵام ئەو کوردە ئازایە بە بەهێزی خـــۆی ماوەتەوەو تامردن پارێزگاری بە ئارامیو تێك نەچوونی خـــۆی کردووەو لە ژێر ئازاردانda ئۆقرەی گرتووە ) .

من ڕێگە بەخۆم ئەدەمو بـــە درێژی ڕووداوێکی‌تر دەربارەی ئازایەتی کورد ئەگێڕمەوە کە بەچاوی خۆم دیـــومـــە .

پانزە ساڵ لەمەوبەر جەعفەر ئاغای هۆزی شکاك ( برا گەورەی سمکۆی بەناوبانگ )،(ڕاستیەکەی جەوهەر(×) ئاغایە ـ مارف ـ ) . لە ناوچەی چیخریکە ( سەلماس ) دا ئەژیا ، بەهیچ جۆرێ لە دەسەڵاتداری فارسی نەئەترسا ، جارجار لە شاخ ئەهاتە خوارەوەو لە دۆڵەکانـدا تاڵانو بڕۆی ئەکرد ، سەیر لەمەسەلەکەدا ئەوەبوو ،کە دانیشتووە هەژارەکان بە چاوی خۆشەویستیو بەزەییەوە سەیریان ئەکرد ، چونکە ئـەو دەوڵەمەندەکانی تـــاڵان ئەکردوو بەشێك لە تاڵانیەکەی ئەدا بە هەژارەکان ، میری پەنای بردە بەر نەسیحەتو سەرزەنشتی کۆنو کردی بەپارێزگاری

(×) سەرگورشتەی ئـــەم جەوهەر ئاغایە لـــە نامیلکەی ( هەمیشە بەهار ) ی مامۆستا عەلادین ســـەجادی دا ڕوونتر باس کراوە .

سنوور ، ئاغا خۆی دابەدەستی مەسەلەکەوەو لەسەرەتادا شانازی بە جێگاکەیەوە ئەکرد ، بەڵام ئەم حاڵەتە زۆری نەخایاندو جێگاکەی بەجێ هێشتو گەڕایەوە سەر خوو ـ رەوشتەکەی خۆی ، وەمن بە چاوی خۆم ئەو شەڕە کاغەزەم بینی کە لە نێوان جەوهەر ئاغاو نوێنەرانی دەسەڵاتداری‌دا کرا ، جەوهەر ئاغا سکرتێرێکی نەبوو کە زمانی فارسی بزانێ ، لەبەر ئەوە بەشەواو بەشێوەیەکی نهێنی شاعیرێکی پیری فارسی‌ی بانگ ئەکرد ، کە ئەم شاعیرە خۆی نووسەرو پەیامبەری نامەکانی والی فارسەکان بوو ، ئەم میرزایە وەڵامی نامەکانی بەشێوەیەك ئەدایەوە کە بەهیچ جۆرێ پەیوەندی بەوەوە نەبوو کە جەوهەر ئاغا ئەیویست وەڵامی نامەکانی والی پێبداتەوە ، کە میرزا خۆی بە رۆژا بۆ والی‌یەکەی ئەنووسی ، وە لە بەد بەختیا پیاوەکانی والی لەهاتووچۆیەکی شەوانەیدا گرتوویانەو ئەوەی نەشێ پێیان کردووە .

لە پاشانا پارێزگاری ئازربایجان دووای سوێند خواردن بە قورئان توانیویەتی جەوهەر ئاغا قەناعەت پێ بکات کە بێت بۆ تەورێزو من خۆم بەچاوی خۆم ئەم سەردارە کوردەم لەگەڵ هەشت پاسەوانی خۆیدا بینی ، کە لەیەك شێوەو تەرزدا فیشەك لغیان دابوو لە خۆیان .

ئەم کوردانە زۆر لە سەرخۆ بوون ، چاویان لەسەر ـ کردەکەیان نەئەتروکان ، لە بازنەیەکی رێکوپێك‌دا دەووریان دابوو ، تفەنگەکانیان لەسەر پێ بوو ، بەڵام هەرنەیان توانی پارێزگاری ژیانی جەوهەر ئاغا بکەن ،

که به خیانەتکاری لەسەر قاڵدرمەکانی لای جەنەڕاڵی پارێزگاردا کوژرا ، جەنەراڵ بانگی کردبوو بۆ چاو - پێکەوتنی خواحافیزی ، بـەڵام پیلانـەکەی لەوەوپێش ئامادە کردبوو ، ماڵەکە بە سەدەها چەکدار دەورە درابوو، پاسەوانە کوردەکان دووای ئەوەی کوشتنی سـەرۆکە- کەیانیان بەچاوی خـۆیان بینی ، زۆر کاری تێ کردن ؛ دەستیان کرد بەتەقە ، بەڵام ئەمانە هەر هەستو غیرەتی خۆیان پاراستوو ، رایان نەکردە دەرەوە ، بەڵکو هەر لە ماڵەکەدا بەرگرییان کردوو، ئەوەش بووە هۆی ترسانو سەرسوڕمانی پیاوەکانی پارێزگار ، چەند کەسێك کوژرانو لاشەکانیان کەوتنە بەرپێ ، هەرچەندە تەقەکە زۆر بەهێز بـووە ، بـەڵام کوردەکان توانیان ڕابکەنە دەرەوەو بچنەوە لای هاوڕێکانیان .

خەریك بوو کوردەکان لەم شەڕەدا جەنەڕاڵ خۆی بگرن ، بەڵام ئەوان دەورە درابوون ، هەر ئەوەش بوو کە لە رۆژێکی خاڵیدا مانەوە ، بەردەوام هەتا ئێـوارە تەقیان کرد بنمیچی ژورەکە کونی لـولـە زۆپایەکی تیابوو(×) ، کوردەکان چووبوونە سـەر شانی یەکتری تاگەیشتبوونە ئاستی ئەو کونە ، دەرگای کونـەکەیان کردبووەوەو هاوڕێ برینداره‌کەیان لێوە دەرکردبوو ، ئینجا خۆیشیان لەو کونەوە چووبوونە سەربانو لەوێشەوە بۆ سەربانی دراوسێکانو ناو باخو کۆڵانەکان ، بـەم

(×) رەنگە نووسەر مەبەستی لە کلاورۆژنە بێت ، ئەگینا کونی لولە زۆپا زەلامی پیا ناچێت .

شێوه جوانه توانیان لەو شاری تـەوریزه گەورەیـەدا بچنه دەرەوه .

لە بەیانی ڕۆژی دوواییدا سەربازەکانی جەنـەڕاڵ چوونه دەرەوەو بۆیان ئەگەڕان ، کوردەکان پیـلانی تایبەتیان بۆ دانانو توانیان بیانخەڵەتێنن ، تـا دەستیان بەسەرداگرتنو لەگەڵ وڵاخەکانیاندا دانیانه بەروو بردنیان بۆ دێی چخریکه ، بەم شێوەیه تەنها - ٦ - کەس لەپیاوەکانی ئاغا رزگاریان بوو ، که خۆیان هەشت کەس بـوون ، بەڵام دووانەکەی تریان لەگەڵ جەوهەر ئاغادا کوژرانو دووای مردنیان بە دەرگای کۆشکی جەنەڕاڵدا هەڵیان ـ واسینو بۆ ڕۆژی دووایش ڕۆژنامە ڕۆژانه ناوخۆییەکان بەشانازی‌یەوه باسی ئەم سیاسەتەژیرانەیان کردبوو !!! . . .

پێنج ساڵ بەسەر ئەم رووداوەدا تێپەڕیو له ( کوتور ) تووشی ئەوانه هەموویان بووم که لەو شەڕەدا رزگاریان بوو ، وه شتی تریشم لەخۆیان بیست که لەکاتی خۆیدا له تەوریز بۆم رێك نەکەوت بیان نووسم .

ئائەمەیه ئازایەتی بێ‌هاوتایی کوردو ئەوەیه ئوسلوبیان ، لەبەر ئەوه پێویستە لەسەر ئەوانەی ئەیانەوێ لـه دژیان هەڵسن ، هەزار حیساب بۆ خۆیان بکەن ، هیچ سەیریش نیه ئەگەر فارسو تورکەکان ببینین قسەی ئەوانه بگێڕنەوه که ئەیان ووت ( کوردەکان لەتایەفەی جنۆکەن)(×) ، به

(×) بۆ روون بوونەوەی ئەم مەسەلەیه سەیری پەراوێزی (ئەستێره)ی لاپەڕه(٣١)ی بەشی دووەم (لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی گەلی کورد ) له کتێبی ژیانی کوردەواری‌دا بکه . به زمانی کوردی .

تەواویش هەر لەبەر ئەم هۆیەبە کە ئەمانە لە ئامادەکردنی پێویستی و توواناى خۆیاندا بۆ تێکۆشان لەدژی کوردەکان، خۆیان بەسەربەست ئەزانن و ریگا بەخۆیان ئەدەن جۆرەها ریگاو شێوەی خەڵەتاندن و فێڵ بازی و خیانــەت کاری بــکەن .

دووای هەڵسانەکەی شێخ عوبەیدوڵـلا ، ســەرۆکی جەنگی فارسەکان ، ئەمیر نیزام(٥) هەمزە ئاغای سەرداری کوردەکانی بانگ کردوو سوێندنی بە قوورئان بۆ خوارد کە تا لەسەر زەویدا بژی خراپەی بەرانبەر نەکات ، بانگی کرد بۆ رەشماڵەکەی خۆی کە لە چاڵێکدا هەڵدرابوو ، وە ئەو چاڵە هەر بۆ ئەو مەبەسـتە هەڵکەنرابوو ، کاتێك هەمزە ئاغا چووە ژوورەوە ، ئەمیر نیزام ئیشارەتی کردوو گوللەیەك تەقی و رەشــماڵەکەی کوون کردوو هەمــزە ئاغایشی کوشت ، دووای ئەوە ئەمیر نیزام مەسەلەکەی بەوە روون کردەوە کە گوایا ئەم پارێزگاری پەیمانەکەی خۆی کردووەو سوێندەکەی نەخستووە ، چوونکە ئــەو وتوویەتی ، تا سەردار لەسەر زەوی‌دا بێ خراپەی بەرانبەر ناکەم و لەو حاڵەتەیشدا ئەو لەژێر زەویدا بووە .

هەروەها ئابەم شێوە خیانەت کاوی‌یانە لەمیان دوواویشدا

---

(٥) ئەم پیاوە لە کوردەکانی ( گاررووس )ـە لەتورکیاش ئیسماعیل حەقی پاشا ( کە ئەمیش هەر کوردە ) ، لــە حەفتاکانی سەدەی رابووردوودا بزوتنەوەی کوردەکانی کوژاندەوە .

کەسوکاری ئەو سەرەك هۆزانە کوژران کە لە ئاهەنگێکی جەژندا میوان بوون ، هەر بەو رێگایەش دەستیان بەسەر یەزدان شێری بە ناوبانگدا گرت ، لەمانــە هەموویانەوە ئەتووانین درووست بوونی گیانی بێ بڕوایی کوردەکان بەرانبەر بە هەموو شتێکی بێگانە کە لە دەرەوە بێت بەدی بکەین ، هەروەها رێنەکەوتنیان لەگەڵ ئــەو رێکخراوە سیاسیانەشدا کە لە راستیدا بەشــێکی زۆریان لێ پێك ئەهێنن ، (سون)ی پسپۆری ژیانی کوردەواریو زانای کاروباریان بەڕاستییەوە ئەڵێ :- (ترسی هەمیشەیی لـە کوردەکان کە تیایاندا دروســـت بووبێ ، بێ بڕوایی و ئازایەتیو بێدەنگیو چاودێری بەرزو پێشکەوتووە) . جا خۆی من لەگەڵ سیفەتی دووەمدام .

چونکە وا رێك کەوت چومە جێگایەك کە یەکەمجار پێش سێ ساڵ رێگام تێی کەنبوو ، لێیان پرســیم کوا ئەسپە کۆنەکەت ؟ . دووای ئەوەی کە هەموو سیفەتەکانیو شتی تریشیان باس کرد کە من خۆم لە زووەوە لە بیرم چووبوونەوە . گومانم نییە کە ئـەمـە بەلای تێروانینی تازەوە بێتە مەسەلەیەکی ئاسایی ، کوردەکان لێهاتنێکی لە رادە بەدەریان هەیە ، بەتایبەتی لە چوونە ناو قولایی هەموو شتێکدا ، ئەوان بە گرنگیەکی زۆرو گومانـەوە سەیری هەموو دەمووچاوێك ئەکەن ، هەموو جارێ کە ئەچوومە ناو کوردەکان ئەوەم لادرووست ئەبوو کەوام ئەزانی دەها چاو وێنەم ئەگرن .

کوردەکان شلو شێواوو بێعەقڵ نین ، بەڵام تـوانای

نەواوی ئەوەشیان نیە کە رۆشنبیری‌و زانیاری خــۆیان پەرە پێ بدەن‌و پێشی بخەن(٦) .

بەزۆرییش هۆی ئەمە خوورەوشتی ئەو سەرۆکانە بووە کەوایان زانیـوە ، باری چاکو پێشکەوتووانە تەنها لــە راهێنان‌و ئامادە کردنی سەربازیدایە(×) ، لەبەر ئەوە ئەبینین

---

(٦) کوردەکان لە سەدە کۆنەکاندا زانای زۆریای داوە بە ئیسلام ( ابوالفداء ، الادریسی ) هەروەها زاناهانی ئاینی‌و شاعیریش ، بروانە نووسینەکانی ( لیرخ‌و مار ).

(×) رەنگە ئەم مەســەلەیە ( ئەگەر مەبەســت لایەنی سەربازی بێ ) لە سەردەمی هاتنی نورسەردا بــۆ کوردستان تا رادەیەك وابێ ، بەلاّم ئەو هۆیەی ئەم داهێناوە بۆ (پەرەپێ‌نەدان‌و پێش نەخستنی رۆشنبیری کوردی ) ، بەرای من هۆی سەرەکی نیە بــۆ ئەو مەســەلەیە لەهەموو سەرانسەری کوردستانی ئــەو سەردەمەدا ، چونکە هــۆی سەرەکی ئەوەبووە کە سەرۆك هــۆزو دەرەبەگەکان لەبەر بەرژەوەنــدی تایبەتی خۆیان تاکو ئەم نزیکانەش هــەر بەدەستی ئەنقەست نەیان‌ویستووە جەمــاوەرەکە رۆشنبیر ببێ‌و پێش بکەوێ‌و چاوبکاتەوەو لەزۆرداری‌و چەوسێنەریی ئەوان بگەن ، ئیتر خەلّکەکەیان مەشـغولّ کردووە بەمەسەلەی‌سەربازی‌و شتی لاوەکی ترەوە کە دووریان بخاتەوە لەپێشکەوتن ، بەلاّم من مەسەلەی پێشکەوتنی رۆشنبیری‌و هەولّ‌و تەقەلای نەتەوەی کورد بۆ پش -

گەنجەکلان هەر بۆ رابووارەن لــە رۆژێکدا دووســەد فیشەك ئەتەقێنن(٧) ئەمەو ئەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە زۆرچار تــوانیووپانە لەفێربووندا سەرکەوتنی خێرا بــە دەست بهێنن . ئەمانە زمان زانێکی چاکن ، بەشی زۆرپان بە زمانی تورکی یاخود فارسی قسە ئەکەن ، ئەو ئەفسەرە کوردانەی کە ساڵەهای ساڵ لەگۆشە دوورەکانی سەر سلووردا ئیشیان کردووە ، ئەو زمانە فەرەنسی‌یەیان لەبیر نەچووبووەوە کە لە قوتابخانەدا فێری بووبوون‌و هەند-یێکیان هەوڵیان‌دا کە بەفەرەنسی قسەمان لەگەڵدا بکەن .

کاتێك ئۆسکارمان لە سابلاغدا گەشتی کردووە ، میرزا جەوادی لەگەڵدا بووەو توانیوویەتی بــە ئەلمانی‌یەکی خێرا قسە بکات ، وە دووای ئەوە چووە بــۆ بەرلین و توانیوویەتی پارەیەکی زۆر بە دەرس وتنەوەی گشتی کە بە زمانی ئەلمانی دەربارەی کوردستان لــە جۆرەها

---

←

خستنی ئەم لایەنە لەم سەردەمەی ئەمرۆماندا ئەهێڵمەوە بۆ خوێنەر خــۆی کە رادەی بزانێ‌و بــەراووردی بکات لەگەڵ ئەو سەردەمەدا کە مینۆرسکی تیاهاتووە بۆ کوردستان .

(٧) لەهەموو حاڵەتێکدا ئەمانە نیشانەکانیان ئەپێکن . وە بەچاوی خۆم سمکۆی بەناوبانگم دی کە قەوانــە فیشەکێکی کرد بەچڵی درەختێکدا کە ئەلەری‌یەوە ، لە دووری (١٥) هەنگاوەوە تەقەی لێ کردوو رێك دای لە ناوەڕاستەکەی .

کۆمەڵو ڕێکخراودا وتونیەتەوە پەیدا بکات .

هەر لەشاری سابلاغ خۆیدا کوردێکم بینی چوبووە شاری نیژنی (شاری گۆرگی ئێستا ـ مارف ـ)و لە بازاڕی ئەوێدا بازرگانی کردبوو ، زمانێکی میللی ڕوسی چاکی ئەزانی ، بەڵام ئەو کوردانەش کە لە قوستەنتینیە یاخود دەرەوەدا خوێنەبوویان لە ڕادەی تورکە ڕۆشنبیرەکانی هاوڕێی خۆیاندا بوون .

زیندوویەتی بیری کوردەکان لە خۆشەویستیاندا بۆ سروشتی کوردستان دەرئەکەوێ ، لەم خاکە لە جوگرافیادا نیشتمانێکی سرووشتیە ، بەردێك نیەو دۆڵێك نیە ، درەختی جیا جیا نیە کە ناوێکی نەبێ ، ئیتر هەر ناوێك هێت ، یان نەبەسترابێت بە ئەفسانەیەکەوە ، لە ساڵی ١٩١٤دا کە لە خواروودا بووین ، دەسکەوتنی هەندێ زنجیرەو ڕووبار لەلای عەرەبو لوڕەکان زۆر ناڕەحەت بوو ، بەڵام کە چووینە کوردستان هەموو شتێك گۆڕا ، هەموو مرۆڤێك قسەی ئەکرد ، هەر ئەوە بەس بوو کە نووشی گەنجێکی ڕووخۆش ئەبووی بەلای ڕانێکەوە ، ئیتر بە شێوەیەك دەستی ئەکرد بە قسەکردن کە کۆتایی نەبوو ، لەژێر فلان بەردا ئافرەتێك خۆی لە دەستی گورگێ ڕزگار کرد ، بەردێکی تر بەم هۆیەوە شکا :ـ کاتێك دوو سوپای دژبەیەك گەشتنە ئێرە لەسەرەتادا هەردوو سەرۆکەکە یەکی جاسوسێکی چاوپیسیان نارد بۆ ئەوەی خراپە بەرانبەر دوژمن بکەن . بەڕێکەووت هەردوو جاسووسەکە لای ئەو بەردەدا ئەگەن بەیەکەو بڕیار ئەدەن کە پاڵەوانبازی،

بکەن ، یەکێکیان هەوڵی داوە بەردەکە بەرزبکاتەوە ، بەڵام شکاوە ، ئیتر دووەمیان هێرشی بردۆتە سەر بەرانبەرەکەی و چاوی کوێر کردووە . . . . . هتد .

کوردەکان حەز لە گاڵتەو گەپ ئەکەن ، لە دەنگوباس زانیندا فێڵ بازن ، شانازی بە ژیانی سەربەستانەوەیان ئەکەن .

ئەوانەی باسی ژیانی کوردەکانیان کردووە زۆرن ، بەڵام کەمیان ئەو ژیانو کەسایەتیەی کوردیان بەهێمنی و لەسەر خۆوە لێك داوەتەوە ، بەشی زۆری ئەو گەڕۆکانەی کە کوردەکانیان دیــوە ، بەزۆری لایەنە چاکەکانیان تێبینی کردووەو نووسیوە . بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی دەربارەی کوردەکان هەبێت و لایەنە خراپەکانیان باس بکات ، سروشتی یەکە بڕوای پێ ناکرێ ، چونکە لــە ئاگاداری یەکی فراوانەوە نەهاتووەو نموونەیشــی لەگەڵدانی یە ، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانرێ لایەنی ڕەشی ڕەوشت لەژیانی هاوچەرخی کوردەکاندا بدەیلە لاوە ، کوردەکان ئەوپەڕی تووڕەن ، لەم ڕووەوە سۆن ئەڵێ :- چەند پیاوێك بەڕێگادا ئەڕۆشتن لەناو خۆیاندا لەســەر شوێنی هەڵهاتنی ئەستێرەی گەلاوێژ لــە ئاسماندا(٨) ،

(٨) ئەو ئەستێرەیە ، بە کوردی ( گەلاوێژ ) ی پێ ئەڵێن ، دەرکەوتنیشی نیشانەی نزیك بوونەوەی گەرماو کاتی ڕۆیشتنە بۆ سەر بەرزایی چیاکان - تێبینی (ڕاستی یەکەی دەرکەوتنی ئەم ئەستێرەیە نیشانەی نزیك بوونەوەی کاتی سەرمایەو لە پایزدا دەرئەکەوێ - مارف - ).

بو بە مشتوومڕیان ، جا پێش ئەوەی ئەستێرە گەشــەکە هەڵ بێت ، هووان سیانێکیان لە خوێنی خۆیاندا ئەگەوزان .

ڕۆژێکیان لە نێوان کێلە شین و سەیدەکاندا کارەساتێکی سەیرمان دی ، ئافرەتێکی کورد لەسەر ڕێگاکەدا دانیشتبوو چاوەڕوانی ئەکرد ، کوردێکی خەیاڵ بڵاویش چوارمشقی لێ ی دانیشتبوو گۆرانی ئــەووت ، نۆبەنەکەیشی(×) بە بارە قورسەکەیەوە بە قەدپاڵەکەوە بوو ، کوردەکە هەڵساو نۆبەنەکەی لێخوڕی ، بەڵام نۆبەنەکە نەی ئەویست خێرا خێرا بڕوات ، خاوەنە کوردەکەی هەر ئەوەندەی پێ کرا بەردێکی گەورەی هەڵگرت و دای بەناو چاوی گاکەدا ، بەڵام زۆری پێ نەچوو پەشیمان بووەوەو بۆی ئەگریا !!. پێویستە دەست نیشانی ڕەوشتی حەق سەندنەوە بکەین و هەندێ جار دڵ ڕەقییان لەم ڕووەوە ، کوردەکان لــە سابڵاغدا میسیۆنێرێکیان (ملەوەر) کوشت ، نەك لەبەر ـ ئەوەی کە تاوانێکی کردبێ ، بەڵکو لەبەر ئــەوەی کە ناوونا تۆرەی دابووە پاڵ ئەو پارێزگارەی حکومەت کە لێ پرسراو بووە لە ئاسایشی ئەوروپاییەکان. ئەم کارەیان بۆیە کردووە چونکە باری گشتی لە بەرژەوەندی ئەوان نەبووە.

وا ئەزانم لەم ڕووەوە کورد لە ئەلبانی ئەچێت ، کە لەزەت لەوە ئەبات بەهــۆی قیشەکەکانیەوە(٩) تواناو

---

(٩) بەراووردی ئیشەکانی ئا . ئا . (باشماکوث) دەربارەی ئەلبانیەکان بکە .

(×) پێش ئەوەی گاجووت ببێتە گاجووت لە کوردەواریدا ( نۆبەن )ی پێ ئەڵێن .

هێزی خۆی دەربخات ، وە سەرسورمان لـــە مەسەلەی تەنها تەقاندن‌و دەرچوونی خێرایی گوللەیەك کە چۆن ئەتوانێ بەخێرایی پیاوێکی بەهێز بکوژێت . گەلێ حاڵەتی دڵ تەزێن لەم کارەوە رووی‌داوە ، لەوانە لەساڵی ١٩١٤دا سکرتێری ئینگلیز میستەر ( هۆبارد )(١٠) ئەندامی لیژنەی دیاری کردنی سلووری تورکی ـ فارسی لەکاتێکدا کە بەنیازی حەوانەوەوە پیاسەی ئەکرد بریندار کرا .

کاتێك کە باسی مەسەلەی ئەو کوشتنانە ئەکەین کە زۆر جار لە کوردستاندا رووئەدەن ، پێویستە لە تێڕوانینی ناوچەکەوە سەیری بکەین ، نەك لـە تێڕوانینی ئێمەی ئەورووپاییەوە ، ڕواڵەتی کوشتن سیفەتی هەنـدێ گەلی دیاری کراو نی‌یە ، بەڵکو ئەوە ئەنجامی باروو زرووفی گشتی‌یەو لە سیفاتی خوێن گەرمی خوارووە، لەم رووەوە پێویستیمان بەوە نی‌یە کە ئیشارەت بۆ ســەر ژماردنە ئەلبانیەکان بکەین . بەڵکو ئەگەر لەلای ئێمە سەیری دوای قەفقاس بکەین،ئەبینین هەموو ساڵێك١٥٠٠ڕووداوی کوشتن ڕووئەدات ، بەڵام‌لە ناوچەی ئەلیزابث پۆڵدا (٣٨٩)(١١)

---

(١٠) بەراووردی بکە لەگەڵ ئەو ڕووداوە بەناوبانگەدا کە زانای ئەرکیۆلۆجی ئەڵمانی ف . بیلك ، ١٨٩٨، باسی ئەکات ، کە بەهۆی گیانی بەرزیەوە لەکارەساتەکە رزگاری بووە ، بۆ زانینیش ئەو چەکدار بووە ، وەکوردەکان لە دووری چەند هەنگاوێکەوە تەقەیان لێ‌کردووە . (ڕاپۆرتی قونسوڵ مایفسکی ) .

(١١) ساڵنامەی قەفقاسی ، ساڵی ، ١٩١٠ .

رووداو و کارەسات رووئەدات ، یاخـود هـەر رۆژی یەکێك ، هەر وەکو ئەم کوشتن بەکۆمەڵە کوشتن نەبێ ، کەس باسی ناکات ، وا ئەزانم راست کردنەوەی هەندێ بیرورِا لەم رووەوە شتێکی دادپەروەرانەیە ، جـارێکیان بە چاوی خۆم لە ساڵی ١٩٠٥ دا لـە دوورەوە بەرِۆژدا هێرشێکی کوردەکانم بینی کە کردیانە سەر دێیەك لە سەلماس ، جووتیارێك رانەکەی ئەلەوەرانـد کوردەکان هێرشیان بردە سەری ، بە دووربین دیمان چـۆن پێش خۆیانیان داو بردیان بۆ سەر شاخ ، بەڵام ئەوەی لـە ئەنجامی ئەم هێرشانەدا بەسەر دێهانەکاندا دێـت ، من ئەتووانم بەتێرِوانینێکی تر دەری ببرِم کە لە ساڵی ١٩١١ داو کاتێك لە دێی ( کە نگرلوو ـ سەلماس ) بووم ، ئاگادار ـ کردنەوەو هاوار هاوار دەستی پێ کرد ، بـەڵام ئەوەی چاك بوو درۆ بوو، گەنجەکان دەستیان کرد بەکۆکردنەوەی رانەکانیان ، پیاوەکانیان لە دووای تارمەکانەوە خۆیـان شاردەوەو ژنانیشیان بەگریان راهان کردە سەرشەقامەکان ، لێرەدا ئەتووانم باسی ئەوە بکەم کە مەسەلەکە لە دێهاتە ئەرمەنی یەکانی تورکیادا چەند ترسناك بوو ، بەتایبەتی کاتێك کە بزانین دانیشتووان نەیان ویستووە بەرهەڵستی بکەن(١٢) . لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لەلایەکی تـرەوە

---

(١٢) بەراووردی بکە لەگەڵ ئەو روالەتەدا کە قونسـوڵ مایێفسکی لەوەسفی هەردوو ویلایەتی وانو بەتلیس دا وێنەی کێشاوە .

سەیری مەسەلەکە بکەین ، ئەویش ئەوەیە کە تالآن کردن بە رۆژی رۆشنا نیشانەی پیسی ئەو فەرمانڕەوایەتیەیە کە ئەو جۆرە رووداوانە لە سێبەریدا رووئەدەن . لە قەفقاس و تورکمینیادا چی رووی ئەدا ئەگەر فەرمانڕەوایەتی رووسی یاساکانی تیانەمایە ؟ ! .

لەبەر ئەوە واقیع شتی تری درووست کردووە بۆ خۆ پاراستن ، چونکە هەوڵی ئەوە نەدراوە کە بەرگری شەڕو هێز بکرێت بەخێر ، بەتایبەتی لە کوردستانی تورکیادا ، بەهێزتریلی ئەم شتانەیش بەرگری نەدراو بەدەستەوەیە بەسەرۆکایەتی سەرۆك هۆزێکی بەهێز ، بەم شێوەیە ئەم جۆرە ئیشانە هەمیشە بە ئەنجامێکی ماتەمیناوی کۆتایی دێت و نارەحەتی بۆ ئەو کەسانە دروست ئەکات کە ئازاری خەڵکانی تر ئەدەن ، هەر لە ئەنجامی ئەوەشدا گەلێ لە ئەرمەنی و نەستووری‌یەکان هاتنە ناو هۆزە کوردەکانەوە بۆ ئەوەی لە چەوساندنەوە رزگاریان ببێت(١٣) ، بەلآم ئەوەی پەیوەندی بە دزی‌یەوە هەبێت ، ئەوە کوردەکان بە شێوەیەکی زۆر چاك ئەو رێگایانە ئەزانن کە دزەکەی پێ ئەگرن ، لە زۆر حاڵەتیشدا ، فێڵ

---

(١٣) وەکو بەدرخان بەگ لە مەرگەوەڕ ، هەروەها مطیع الله لە موکس ، حسین پاشا لە ئەدیل جیواز لەساڵی ١٨٩٥دا . وە قائمقام حاجی خان لە نوردوز لە ساڵی ١٨٩٨ داو... هتد . وە ئیبراهیم پاشا (شاروێران) لە قەتڵ و عامەکەی ئەرمەندا هاوبەشی نەکردووە .

لــه دزه‌که‌وه وه‌رئه‌گرن ، دزیو تالآنی زۆر جار بــه ساده‌یه‌کی ته‌واوه‌وه رووئـه‌دات(١٤) . جارێکیان رێ نیشانده‌ره‌که‌م به‌پێ ئه‌رۆیشت ؛ کوتوپڕ خۆی هه‌ڵدا بۆ پشه‌وه‌و چووه سه‌ر پشتی که‌رێکی بـۆرو دووای دوو سه‌عاتێك خاوه‌نی راسته‌قینه‌ی که‌ره‌که هات‌و به‌بێ هیچ هاوارو شه‌ڕه‌شه‌قێك ولآخه‌که‌یان لێسه‌نده‌وه ، به‌لآم لـه پشده‌ر دوژمنایه‌تی له نێوان رێ نیشـان ده‌ره‌کانی ئێمه‌و کورده‌کانی ئه‌وێدا هه‌بوو ، جا ئیتر ئه‌وکوردانه‌ی ئه‌وێ شه‌و هاتن‌و (١٠) ده ولآخی ئێمه‌یان دزی که نرخی هه‌ر یه‌کێکیان (٢٠٠) رۆبڵ بوو ، ناچاربووین که کاربه‌ده‌ستانی ده‌سه‌لآت داری تورکی له رووداوه‌که ئـاگاداربکه‌ین ، ئه‌وان زۆر به‌خێرایی توانیان دزه‌کان بناسن ، بـه‌لآم ئێمه ته‌نها هه‌شتیانمان ده‌ست‌که‌وته‌وه(١٥) ، والـه‌زانم

---

(١٤) هه‌ر بۆ به‌راورد کردن‌و زانینی شتێکی گشتی له مسته‌وای دانیشتووانی نزیك به کوردستان ، ئـه‌م رووداوه‌ی لێپرسراوی ره‌سمی رووسی باس ئه‌که‌م ، ئه‌ویش په‌یوه‌ندی به گاورێکی موسڵه‌وه هه‌یه له نزیکی سـاڵی ١٨٨٠دا ( وارێك ئه‌که‌وێ که شـتێك له نووسینگاکه‌یدا نامێنێ‌و ئـه‌و که‌سـه‌ی له‌بیر بووه که له‌وێ بووه ، معاونه‌که‌ی ناردۆته سه‌ری‌و ده‌ست به‌جێ دزه‌که دێت‌و شته دزراوه‌که‌ی پێ ئه‌بێ‌و به‌پێکه‌نینه‌وه ئه‌ڵێ ئه‌مه ئه‌وشته‌یه که له ئێوه‌م دزیووه ) .

(١٥) من لێره‌دا نامه‌وێ سه‌رکه‌وتنی تورکه‌کان له‌م رووه‌وه

←

ئەو دووانەگەی تریان لەباتی هەوڵو تەقەلاکەی خۆیان گلیان دابوونەوە ، ئەمەو ئەتووانم ئەوە دووپات بکەمەوە کە دزی لــە شاخی رووتــدا نارەحەت ترە لــە دزی ناو شارەکان .

←

باس بکەم ، چونکە هیچ دەســەڵاتداری‌یەك لــەم ناوچەیەدا نی‌یە ، قائیمقام خۆیی‌و چەند جەندرمە- یەکی لە قەڵادزیّدا ئەژین‌و ، وەکو دەورە دراو- وان ، بەڵام سەرکەوتن لە دۆزینەوەی دزی‌یــەکەدا پەیوەندی بە سەرۆکە کوردەکانەوە هەبوو ، ئەوانەی ویستیان دەســەڵاتی خۆیان لە بەردەم لیژنەکانــدا دەربخەن ، هەروەها پاراستنەوەی شەخسی نێرراوەکانی تــورك .

# بەشی حەوتەم

## باری ئافرەت ، پەیوەندی کورد لەگەڵ گەلانی تردا
## هەلەی کورد

## باری ئافرەت ، پەیوەندی کورد لەگەڵ گەلانی تردا ، مەسەلەی کورد

باس کردن‌و لێکۆڵینەوەی باری ئافرەت ، بۆ دیاری کردنی رەوشتی هەرگەلێك زۆر گرنگە ، هەروەها ئەمەش پەیوەندی بەکوردەکانەوە هەیە ، لەم رووەوە ئەمان لە هەموو گەلە ئیسلامی‌یەکانی تر لێ بووردنیان زیاترە ، ژن‌و کچەکانیان ئیشوکاری نارەحەتی ناومـاڵ ئەکەن . لەکاتی ئاو ئەهێنن‌و ، بۆ ران دۆشین‌و دارو دەوەن هێنان ئەچنە سەرچیا بەرزەکان ، سەرەرای ئەمانەو بەشێوەیەکی هەمیشەیی مناڵە بچکۆلەکانیان هەڵگرتووەو بەپشلوێنێکی پان ئەیان بەستن بەکۆڵیاندا(۱) .

ئافرەتیان بێ پەچەن ، بە ئازایی‌و بەبێ شەرم کردن لەناو کۆرو کۆمەڵدا دائەنیشن‌و زۆر جاریش لە گفتوگۆدا هاوبەشی پیاوان ئەکەن ، سۆن ئەڵێ ( زۆر جار رێك-

(۱) قونسولی گشتی ئوردلوف ، وەسفێکی چاکی لێ هاتنی ئافرەتانی جاف ئەکات ، بەتایبەتی لەکاتی کـۆچ کردندا ، هەروەها وەسفی شووانی سەر رێگا نارەحەت‌و تەسکەکان ئەکات . . . هتد .

کەوتووە ژنی ماڵ پێشوازی کردووم‌و مێردەکەشی لەوێ نەبووەو لەگەڵما دانیشتووەو قسەشی لەگەڵ کردووم ، هیچ خۆی بەشەرم‌و حەیای درۆینەوە پیشان نەداوە ، یان وەکو سادەیی ژنانی تورك‌و فارس ، وە زۆر بە دڵخۆشی‌و کامەرانی‌یەوە خواردەمەنی بۆ ئامادە کردووم ، کاتێك کە مێردەکەشی لە ئیش ئەگەڕایەوە ئەو وەکو ڕێزێك بۆ من هەر بەجێی نەئەهێشتم هەتا پیاوەکەی ئەسپەکەی ئەبەستەوەو خۆی ئەهاتە خێوەتەکەوە ) .

هیچ پەردەیەك لە نێوان کچ‌و کوڕیاندا نی‌یە ، ئەوان بەشێوەیەکی زۆر چاك یەکتری ئەناسن ، ژن هێنانیش لە ناویاندا بە ڕێك‌کەوتن ئەبێ ؛ هەستێکی ڕۆمانتیکی فراوان دەستی بەسەر دڵیاندا گرتووە . پێش - ٢٠ - ساڵ لەمەوبەر ڕووداوێکی سەیر لە سابلاغدا ڕووی داوە ، ئەویش ئەوە بووە کە کچە گەنجێکی ئەوروپایی بەدیل ئەگیرێ‌و لەوێدا ئیسلام ئەبێت ، قونسوڵ‌و باوك‌و دایکی کچەکە گەلێ هەوڵی بێ‌هودەیان لەگەڵدا دابوو بۆ گەڕانەوەی ، بەڵام کچەکە ڕازی نابێ‌و ناگەڕێتەوە بۆ نیشتمانی خۆی‌و لەگەڵ مێردەکەیدا ئەمێنێتەوە(٢) .

تەڵاق لای کوردەکان شتێکی ئاسانەو بەخێرایی ئەدرێت ، هەندێ جار کە لە نێوان خۆیاندا لەسەر شتێك

---

(٢) ولسۆن :- زیانی فارسی‌و جل‌و بەرگ ، نیۆیۆرك ، ١٨٩٩ ، بەزمانی ئینگلیزی ، هەروەها وتاری د . دیلیاییف .

مشتوومڕیان ئەبێت ، ئەڵێن ئەگەر فلان شتە وانەبێت ، تەلاقی ژنەکەی کەوتبێ . ئەم شتە زۆر بەئاسانی روو

ئافرەتی کوردو هاوبەشی کاروباری ژیان

ئەدات‌و دووایش پەشیمانی دەست پی ئەکات‌و ئازار ئەچێتە هەسـتی مێردەکەوەو ، بەختیارییش لەوەدایە کە جارێکی تر بگاتەوە بەژنە کۆنەکەی ، ئەمەش لەوشتانەیە کە بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام ناکرێت ، تا شو بە پیاوێکی تر نەکات‌و تەلاق نەدرێتەوە ، وە هەر بۆ دەرخستنی راستیش ئەبێ باسی ئەوە بکەین کە بەشێوەیەکی گشتی ئەم رەوشتە لە شارەکاندا بلاوە ، بەلام لەناو هۆزە کۆچەرییەکاندا خوورەوشت‌و نەریت سادەترن .

کوردەکان هەڵپەرکێیەکی تایبەتیان هەیە پێی ئەڵێن (چۆپی) ، لەم هەڵپەرکێیە بە کۆمەڵ ئەکرێ‌و بازدانی

ئیایه ، هەڵپەرکێ کەرەکان خۆیان ئەنووسێنن بەیەکەوەو دەستیان لەدەستی یەکتری هەڵ ئەپێکن و نیگاریان ئەڵێی دیوارێکەو ئەجوڵێتەوە ، وە یەکێکیان سەرکردایەتی(×) هەڵپەرکێکە ئەکات .

یەکێك لە دەرەبەگە دەوڵەمەندەکان ئاهەنگێکی لەم جۆرەی لەبەر خاتری من ئامادە کردوو هەموو ئافرەتانی دێکە لەگەڵ پیاوەکانیاندا لەسەر ئاوازی زوورناو دەهۆڵ هاوبەشی هەڵپەرکێکەیان کردو تا ئێوارە بەردەوام بوو .

گومانی تیانی‌یە کە ئافـرەت لەنــاو کوردەکانــدا شەخســی‌بەتی هەیە ، هیچ سەیریش نی‌یە ئەگەر ببینین ناویان بخرێتە ســەر ناوی کوڕەکانیان ، ئەگەر هات‌و زیرەکی تایبەتی یاخود جوانی هەبێت(×) . بۆ نموونە ( باپیر شاشان ) مالای ( باپیر کوڕی شاشانە ) .

لەم شاشانە دایکی باپیرەو بـەم شێوەیە باپیر بەناوی دایکی‌یەوە بەناوبانگ ئەبێت . لەم رووەشەوە نموونەی

---

(×) نووسەر لێرەدا مەبەستی لە چۆپی کێشەکە هەڵپەرکێکە ئەبات بەڕێوە .

(×) وائەزانم مەسەلەی بانگ کردنی کوڕ بەناوی دایکیەوە تەنها پەیوەندی بەزیرەکی‌و جوانی‌یەوە نیە ، تەنها ئەوەنــدە هەیە ئافرەتەکە واتــە دایکەکە بەهــۆی شتێکەوە ، ئیتر هەر شتێك بێت ، بناسرێت ئیتر بەسە بۆ ئەوەی کوڕەکەی یاخود جاری وا هەیە مێردەکەشی بەناوی ئەوەوە بانگ بکرێ وەکو ( حمە فاتە ، خولە ئایشێ ، حەبە تەلە . . . . هتد ) .

زۆر هەیە، گەلێ ئافرەتی کوردە هەن بوون بە سەرۆکی هۆزەکانیان‌و هەموو دەسەڵاتێك لە ژێر دەستی ئەوانـدا بووە. کاتێك تورکەکان بە شێوەیەکی تەواوی دەستیان بەسەر ناوچەی هەکاریدا گرت، ئافرەتێك فەرمانڕەوایەتی ئەکرد (هارتمان).

لە ساڵی ١٩١٤ داو لە شارە بچکۆلەکەی هەڵەبجـەدا لە نزیکی سلێمانی‌یەوە چاوم بە عادیلە خانمی بەناوبانگ‌و بێوەژنی عوسمان پاشای جاف کەوت کە هـەر لەپێش چەند ساڵێکەوە سەرۆکی راستی‌و دروستی ناوچەکە بوو، چونکە مێردەکەی هەمیشە لە ماڵەوە نەبووە. (سـۆن) ماوەیەك بەدزی‌یەوە بە ناوی بازرگانێکی فارسەوە لـە کۆشکە بچکۆلەکەیدا ژیـاوە و بەسەرسوڕمان و رازی بونـەوە دەربارەی فەرمانڕەوایەتی ئـەم ئافرەتـەی نووسیوە، هەر لەو کاتەشدا ڕەوشتی ژنانەی عادیلە خانمی لە کڕینی قوماش‌و ئیشی ناوماڵدا وەکو ئافرەتی ناوماڵ لە بیر نەچووە. بەڵام لەم کاتەی ئێستادا(×) حکومەتی تورکی فەرمانبەرێکی تورکی ڕەگەزی ناردووە بۆ هەڵەبجـەو ئەمەش بووتە هۆی دوورخستنەوەی (عادیلە خانم) لە فەرمانڕەوایەتی بۆ ئەوەی تاڕادەیەك بە ئاسوودەیی بژی، وە ئەم ئافرەتە بە شێوەیەکی چـاك پارێزگاری خـۆی کردووە، جارێکیان هات بۆلامان بـۆ بارەگاکەمان و کۆمەڵێك بووك‌و کارەکەرەکانی لەگەڵـدا بوو، وە بە

---

(×) مەبەست لەکاتی هاتنی نووسەرە بۆ کوردستان.

خاتو عادیلە خانمی خێزانی وەسمان پاشای جاف و
احمد مختار جافی کوڕی، کەمناڵە بچکۆلەکەیانە ،
وە عیزەت بەگی کوڕی ، کەمناڵە گەورەکەیانە .

دلخۆشی یەوە رازی بـو کە وێنەی بگرین. بەنامەیەکیش کە بەزمانی فەرەنسی نووسرابوو لە وەڵامدا بۆ ئـەو دیاری یانەی کە پێشکەشم کردبوو بە کوڕەکەی، سوپاسی کردبووم. لە دووایدا دەرکەوت کە ئەو نامەیە گەنجێکی کورد نووسیبوی کە لە شاری سنەدا لە لای میسیۆنێرە-کاسۆلیکەکان فەرەنسی خوێندبوو.

خاوەنی هەڵەبجە(×) بایەخێکی زۆری بەو تەنها ئافرەتە ئەوروپایە ئەدا کەلە نێردە زانستی یەکەی ئێمەدا هوو، ئەگەر

ئافرەتی کوردستان بەشانی پیاو لە هەموو سەردەمەکانداو لە هەموو کاروبارێکدا هاوبەشی پیاوی کردووە.

---

(×) مەبەست لە عادیلە خانمە، چونکە ئەو وەختـە بـە خاوەنی هەڵەبجە بەناوبانگ بووە.

بیوویستایە بمانهێنێ ئەوا خۆی ئەهات بۆ بارەگاکەمان، دووای ئەوە خەڵکانی تر ئەهاتن و ماست و توو هێلکەیان بۆ ئەهێنانین . . . هتد . . . هیچ پرسیارێکی نەشیاومان لێ نەبیست یاخود قاقای پێکەنینی بێتام و ناڕەحەت . بوونی ئێمە لەوێدا بوو بووە هۆی خۆشی و شادی ، بەڕاسلی و دلسۆزییەوە میوانداری یان ئەکردین و دیاری یان پێشکەش ئەکردین و ئیشو هیواکانی خۆیانیان بۆ ئەگێرایەوە .

کوردەکان حەز لە منالی زۆر ئەکەن ، لەدەوروپشتی سەرۆکدا ژمارەیەکی زۆر منالان ئەبیلی ، دە تا دووانزە ،

خێزانێکی کوردەواری کە باپیرەو باوکو کوڕو کوڕەزای تیایە ، وەك شانازیش بەڕەگەزەوە .

زۆر جار له شاخه‌کاندا گورد ئه‌بینی هه‌وای پیری‌یه‌تی خۆی به‌ده‌سته‌وه‌یه. رووداوێکی سه‌له‌ره‌کانی پێشـــووم له‌یاده، له کاروانێکداو به‌رێگایه‌کی له‌سکدا ئه‌ڕۆیشتین کوتوپڕ له‌پشت شاخه‌کانه‌وه له‌سه‌ر ئـــه‌و رێگایانه‌ی که ته‌نها بزنی پیا ئه‌ڕوات دووشت ده‌رکه‌وتن، یه‌که‌میـان کوردێك بوو جلی شـــڕی لـــه به‌ردابوو، جووتیارێکی هه‌ژار بوو، منالێکی له باوه‌شدا بوو، به پارچه کۆنه‌یه‌ك پێچرابووه‌وه، ژنه‌که‌ی له دوواییه‌وه بـــه ده‌موچاوێکی جوانو مانه‌میه‌وه ئه‌ڕۆشت.... وا ده‌رئه‌که‌وت مناله‌که له‌سه‌ربانه‌وه که‌وتبووه خواره‌وه و ئازاری پێ گه‌یشتبوو، باوكو دایکي هاتبوون بـــۆ ئه‌وه‌ی بیبه‌ن بۆلای ئـــه‌و پزیشکه‌ی که له دێ دراوسێکه‌یاندا ئه‌ژیا، کاتێك که ئێمه‌ی ئه‌ورووپاییان دی، (ئه‌ورووپایی وه‌ك شتێکی سروشتی لای رۆژهه‌لاتیه‌کان پزیشکن)، دایکه‌که به‌په‌زه‌ییه‌وه لێمان هاته پێشه‌وه‌و که‌وت به‌سه‌ر قاچماندا ماچی بکاتو لێمان بپاڕێته‌وه تاکو کوره‌که‌ی رزگار بکه‌ین. له‌م رووداله‌ته‌دا راستی ته‌واوو ئازاری زیندو ده‌رئه‌که‌وت، لێره‌دا گومانی گشـتی کورده‌کانم بیرکه‌وته‌وه که ده‌رباره‌ی ترس و مردن هه‌یانه.

هه‌روه‌ها وته‌ی سه‌رۆکێکیان (مردن له‌ناو جێگادا عاره، ئه‌گه‌ر بۆم رێك که‌وتو به‌گولله بریندار بووم، ئـه‌وا کاتێك هه‌لم ئه‌گرنو ئه‌مبه‌نه‌وه بۆ ماله‌وه، ئه‌وه گومانی تیانیه که هه‌مووان دلخۆش ئه‌بن، چونکه وه‌کو پێوویست مردووم). له‌وانه‌یه دایکه کورده‌کانیش بڕوایان بـــه‌م

منداڵێکی کورد لەم سەردەمەدا

فەلسەفە دڵ رەقیە هەبێت ، لەگەڵ ئەوەشدا ئازاری ئەم ئافرەتە لێ قەوماوە شایەتی لەسەر دڵ سافی ئەدات .

دیارە لە توانادا نیە وێنەیەکی تەواو دەربارەی رەوشتی گەلێکی بەشکراو بکێشرێت ، کە بەش بەش کرابێ بە گەلێ هۆزەوەو لە ناوەندێکی جوگرافی جۆراوجۆردا بێتو رۆشنبیری یەکی یەکگرتووی نەبێت ، لەمەش گرنگتر ئەوەیە کە ئەم گەلە تاکو ئێستا لێی نە کۆڵراوەتەوە . وا چاکە باسی رەوشتی کوردەکانو ئەو جیاوازی یانەی تیایەتی بکەین ، ئەویش لەسەر بناغەی

تێکەڵاوییان لـەگەڵ خەڵکانی تـردا بەتایبەتی گەلـە گاوورەکان ، گومانی تیانییە ئەم گەلانە لەیەك ناوەندی کۆمەڵایەتیدا ئەژین و هەموویان خوورەوشتیان وەك یەك وایە ، تەنانەت لەو شوێنانەشدا کە هەر دەسەڵات داری میریشی تیانیبە(۳) . کوردەکان لەناوچەی سـلێمانی و سـابلاغدا چاکترو باشترو پێشکەوتووترن لـە کوردی شوێنەکانی تر . ئەو ژیانەی کە توخمی شەڕی تیایە زۆرن ( وەکو ژیانی ئازربایجانیەکان و تـورکە شـیعەکان و ئەرمەنەکان ) ، کوردەکان پیس ئەکەن و درۆو ڕێڕەوی ڕۆحییان تیا دروست ئەکەن ، یەکەمیان ئەوانەن کە وەڵامی لێدان بەلێدان ئەدەنەوە ، دووەمیشیان لاوازیو ڕۆح سوکی دانیشتووان بەهەل ئەزانێو بۆ ئەوەی دەستیان بەسەردا بگرێ ، بڕواش بەوەی کە هێز ئەبـێ دادپەروەرو لـە پاشماوەکانی شارستانیەتی کۆنەوە بێت ، بەڵام ناتوانین وەکو ئیش پێ کردن هەست بەم تیورە بکەین ، لە کاتێکدا کە مرۆڤ ئەبێتە گورگێ بۆ مرۆڤ ، لاوازییش تەنهـا خاوەنەکەی نامرێنێ بەڵکو بەهێزەکانیش پاڵ پێوە ئـەنێ کە زوڵمی زۆرتری لێبکەن . وە هەر دەسـەڵاتی بەهێزی دەوڵەتەکە لە توانێ لەگەڵ بەرژەوەندی بچوکدا بوەستێ و

---

(۳) جارێکیان لە شەقامو بازاڕەکانی شارە بچکۆلەکەی سەقزی کوردا گەلێ ڕواڵەتی مالەمینیم بینی ، وە بەهیـچ جۆرێکیش نوێنـەری دەسـەڵاتداریی تیانەبووە .

ئەتووانێ پارێزگاریی تەرازووی هێزەکان بکاتو پەیوەندی نێوان کوردەکانو گەلەکانی تر دیاری بکات ، بـەڵام فارس زۆر لاوازن ، تەنانــەت ناتووانن پارێــزگاری دانیستووە کوردە موسوڵمانە دامەزراوەکان بکەن . بەڵام تورکیــا بەشێوەیەکی بـەردەوام کوردەکان لــە دژی ئەرمەنییەکان هان ئەدەنو هەستی ئاینیان بەهەل ئەزانن .

## کــورد لــه رووســــیا

ئەو کوردانەی لە رووسیادا ئەژین مەسەلەیەکی تایبەتی لە سیاسەتی ناوخۆماندا پێك ئەهێنن ، کوردەکان بـۆ یەکەمجار لەخاکی رووسیادا ، دووای مۆر کردنی پەیمانی گولستان لەگەڵ دەوڵەتی فارسیدا لـە ساڵی ١٨١٣ دا سەریان هەڵدا(١) . کاتێك کە ناوچەی ئەلیزابێث پوڵ مان خستە سەر خاکی خۆمانو دووای هێرشی تورکەکان لە ساڵی ١٨٢٨ دا کوردەکانی ئەریڤان لە وڵاتی فارسەوە هاتنە لای ئێمەو لە کۆتاییدا لە ساڵی ١٨٧٨ داو لە ئەنجامی کۆچ کردنیان لە ناوچەکانی فارسو ئەردەهانەوە(٢) ، ژمارەی کوردەکانی رووسیا دوو ئەوەندە زۆرتر بوون . هەر کاتێك شەڕ لە دووای ئەفقاسەوە هەڵبگیرسایە ئێمە بایەخمان زیاتر ئەدا بە کوردەکان ، هــەر ســەرۆکی بزووتنەوەکان خۆیان ئاگاداریان ئەکردینەوە کە پەیوە-

---

(١) یان بەشێوەیەکی وردتـر دووای سـەرکەوتنی (تسیتسیانوف) لەساڵی ١٨٠٤ ـ ١٨٠٥دا ـ ئەمیریانوف ـ

(٢) دەربارەی کوردو دانیشتووانی ناوچەکانیان بڕوانە بەشی یەکەمی لەم کتێبە .

ندیمان پاش بێت لەگەڵیاندا ، ئەم حالەتە لەسەر ئـەم شێوەیە بەردەوام بوو ، بەشێوەیەکی تایبەتی لەسەردەمی (عەقید لوریس ملیکۆف ) دا ـ ١٨٥٣ ـ کە سەرۆکایەتی ئەم بزوتنەوالەی ئەکرد .

لە ساڵی ١٨٢٩ داو لە شەڕەکەماندا لە دژی تورکەکان چوار تیپی ئیسلامیمان هەبوو ، یەکێك لەوانـە کوردی پالاوتە بوو ، (٤٠٠ سوار بوو )(٣) ، لە شەڕی قرمیشدا دوو تیپی کوردیمان هـەبوو ، یەکەمیان تیپی قارس ، دووەمیشیان تیپی ئەریڤان ، سەرتیپی دووەم ، ( رەئیس ئەوەل )(×) جەعفەر ئاغا بوو کە لە دوواییدا بەرز بووەوە تاوەکو گەشتە پلەی (جەنەڕال )(×) گەلێ خزمەتی زۆر چاکی کـرد ، چونکە بەهۆی ناوبانگی شەخسیەتیەوە ئەیتوانی کار بکاتە سەر کوردەکانی دەرەو ، هـەموو ملاڵو وەچەکانی موچەی تەقاوێتیان لە حکومەتی روسی وەرئەگرت ، یەکێکیان عەلی ئەشرەف ئاغا شمس الدینۆف بوو ، کە ئێستا(×) سەرۆکی کوردەکانی رووسیایەو لە

---

(٣) سەرکردەکەی ئەفسەرێکی رووسیو یارپەدەدەرەکەشی بەگێکی کورد بوو ، هاوڕێیەکی رووسیو مەلایەکو پۆستەچییەکیشی هەبوو .

(×) ئێستا لە سوپادا بە ( رەئیس ئەوەل ) ئەڵێن ( رائید ) .

(×) پلەی ( جەنەڕاڵ ) لە سوپای ئێستەدا پلەی ( زەعیم ) ی جارانەو ( عەمید ) ی ئێستایە .

(×) مەبەست لەو ( ئێستایە ) سەردەمی هاتنی نووسەرە بۆ کوردستان .

پلەی جەنەراڵدایە(٤) .

لیپێکی میلیشیای کوردیش کە ١٣٠٠ کەس بوو لە ساڵی ١٨٧٧ ـ ١٨٧٨ دا شەڕیان بۆ کردین ، لە ڕاستیدا لەم تیپە گرنگییەکی جەنگی ئەوتۆی نەبوو ، بەڵام دەربارەی ڕەوشتی سەربازەکانی گەلێ ڕاپۆرتی چاك چاك لە سەرۆکەکانیانەوە نووسراوە ، مەسەلەکە هەر چۆن بێت ، ئەم میلیشیایانە کەڵکێکی گەورەیان هەبوو کەتوانیان سەری هەموو ئەو کەسانەمان بۆ دابنەوێنن کە گیروگرفتیان بۆ دروست ئەکردین و ئەمن و ئاسایشیان تێك ئەدا(٥) .

خەڵکانێك کە متمانەیان ئەکرێتە سەر شایەتی ئەدەن کە حاڵەتی کوردەکان لەم کاتەدا باش نییە ، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە خاوەنی خاکی خۆیان نین و ئەوەش بوەتە هۆی ئەوەی کە بەشی زۆریان بگەڕێنەوە بۆ تورکیاو لەوێ دەوڵەت کەڵکیان لێوەرئەگرێ بۆ زۆرکردنی ژمارەی تیپەکانی (حەمیدیە) ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە کوردەکان لە تورکیاو فارسدا لە ساڵێکدا شەش جار شوێنی کۆچ و گەشتەکانیان ئەگۆڕن ، بەڵام لای ئێمە

---

(٤) جەعفەر ئاغا لە ساڵی ١٨٧٦ دا مردووە ، بێجگە لە خێزانی شمس الدینوف ، خێزانێکی کوردی بە ناوبانگی تریش لە رووسیادا هەیە کە خێزانی فاتیح بیکۆفە .

(٥) بەشی زۆری ئەم بڕوانامانە لە ڕاپۆرتی لیژنەی پاشماوەکانی قەفقاسدا بڵاوکراونەتەوە .

لەوەڕگاکان تەنها بەشی دوو مانگی هاوین ئەکەن .

ئێمە زۆرجار وائەزانین دامەزراندنو نیشتەجێ کردنی هۆزە کۆچەری‌یەکان پێشکەوتنێکی سروشتیەو هەر ئەبێت، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشــدا ژیانی شــووانی‌یەتی شــتێکی زەرووری‌یە بۆ تەواوکردنی ژیانی کشــتوکاڵی و کەشاوەرزی(٦) ، بەلاّم دەربارەی کوردەکان ئەبێ ئەوەی بخرێتە سەر کە ئەو ناوچانەی کەڵکی لێوەرئەگرن لــە نزیکی ئاراراتەوە بۆ کشتوکاڵ ناشێن ، لەلایەکی تریشەوە ژیان لە هاویندا لەشوێنە نزمە پڕ زۆنکاوە پیسەکاندا شتێکە کە بەرگەی ناگیرێ ، لــە کۆنەوە پێشنیار کراوە بــۆ دامەزراندنی لیژنەیەکی تایبەتی بۆ رێکخستنو یەکخستنی ئیــدارەی کوردەکان(٧) ، وەکــو لــەوەی کە بــۆ

---

(٦) یەکێك لە پسپۆرەکانی ژیانی کوردەواری ئەم پرسیارە ئەکات :- ئایا زەرووری‌یە شووانی چاك بگوێزرێتەوە بۆ کێڵگەی خراپ ؟. بەلاّم ئەبێ ئەوەمان لە بیــر نەچێ کە ئەو کوردانەی لە قەراغی چەپی رووباری ئاراس‌دا ئەژین شارستانیش‌و جووتیاریشن ، بڕوانە . یکیازاروف ، لە نووسینەکانی بەشــی قەفقاســی کۆمەڵەی جوگرافیای ئیمپراتۆری‌یەتی رووســی ، بلاّوکراوەی ، ١٣ ، بەشی دووەم ، سالّی ، ١٨٩١ ، لەگەڵ ئەوەشــدا ئــەو سەرژماردنانەی کە تیایەتی کۆن بوون .

(٧) ئەم پێشنیارە لــە سالّی ١٨٥٥ دا یەکەمجار لەلایەن

نور کمانەکانی ناوچەی ( ستافرۆپۆل ) مان کردوو کەڵکی نــەبــوو .

پەیوەندی ئێمە بە کوردەوە روون نی‌یە ، ئەوان نازانن بچنە لای چی فەرمانبەرێك ، ئەوان بۆ رێکخستنی کارو باریان زۆر زۆرن ، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بـەدادگاوە هەبێت ، لای ئێمــە گرێ گرێ‌باویــەو کورد ناتوانێ تێ‌ی بگات .

تەنها شتێکی زەروری بۆ کوردەکان قوتابخانەیە(٨)، چونکە گەلێکی دوواکەوتووەو ئەبێ پاڵی پێوەبنرێ بەرەو زانیاری(×) ، لەم کاتەی ئێستادا یەك قوتابی هەیە لـە

---

← ■

– لوریس ملیکۆف – پســپۆرو زانای کاروبــاری کوردەکانەوە پێشکەش کــرا ، کە ئەوساکە لەسەر فەرمانی جەنەراڵ ـ ئەمیراڵ موراڤیف ـ ئەم لێ‌پرسراوی ئیدارەی هۆزەکان بووە .

(٨) لــەم کاتەی ئێستادا دوو قوتابخانەی کوردی لــە ئەریڤاندا هەیە ، ئەوەی لەم رووەوە شایانی باسە ، ئەوەیە کە قوتابخانەیەکی منالانی کورد لە شاری ( خۆی ) لە ئێراندا هەبوو ، ئەویش لەژێر سەرپەرشتی قونسوڵی رووسیدا بوو .

(×) هەرچەندە لێرەدا نووسەر باسی کورد لــە رووسیا ئەکات ، بەڵام ئێمە هەر ئەبێ ئەوە روون بکەینەوە

← – –

خارکۆف ئەخوێنێ ، یەکێکی تریش لە کییف ، ئەبێ ماوە بە کورد بدرێت بچێتە خزمـــەتی سەربازییەوە ، چـــونکە ئەو مەسـەلەیە لەگەڵ هەوەس و ئارەزووەکانی ئـــەودایـــە .

ستاریا رووسا
٣٠/مایس/١٩١٥

---

← کە ئەم مەسەلەیە تەنها بۆ ئەو سەردەمە راســـتە کە نووسەری تیا هاتۆتە کوردستان ، ئەگینا زۆر دەمێکە لە هەموو سەرالسەری کوردستانەکانداو تەنانەت لە رووسیاشـــداو - بەتایبەتی کوردســـتانی عێراق - قوتابخانەو مەڵبەندی رۆشنبیری و زانیاری بەناوبانگ بڵاوبووەتەوەو ئیتر نەتەوەی کورد لـــە زۆر رووی ژیاندا پێشکەوتووەو ، وا نەماوە کە نووسەو باسی ئـــەکات .

# کارەکانی نووسەر لە بواری کوردناسی دا

**بەزمانی رووسی :-**

١ - ئەو زانیاری‌یانەی کە پرس پێ کەری قونسولیەتی گشتی لەتەوریز - بەرێز مینۆرسکی - لەکاتی گەشتەکەیدا بۆ مەراغەو ناوچەی رووباری جاگات‌و تاتاو لە سەرەتای ئابی سالی ١٩٠٦ دا کۆی کردۆتەوە ، ( دەنگو باسی سەرکردایەتی ناوچەی قەفقاسی جەنگی ، ١٩٠٧ ، بەرگی دووەم ، ژمارە ، ٢٠ ، لاپەرە ، ٣٣-٥٥ ) .

٢ - راپۆرتێك دەربارەی گەشتی مینۆرسکی پرس پێ کەری قونسولیەتی گشتی لە ئازربایجان بۆ ناوچەی ماکۆ لە تشرینی یەکەمی سالی ١٩٠٥دا ، ( کەرەسلە بۆ لێکۆلینەوەی رۆژهەلات ) ، ١٩٠٩ ، بلاوکراوەی یەکەم ، لاپەرە ، ١ - ٦٢ ، لەگەل نەخشەدا .

٣ - ئەهلی حەق یاخود ( عەلی ئیلاهی‌یەکان ) پێشەکی ، تێکست ، وەرگێران ، مۆسکۆ ، ١٩١١ .

٤ - هەندێ زانیاری دەربارەی دانیشتووانی هەندێ ناوچەی سەرسنووری تورکی - فارسی (کەرەستە بۆ لێکۆلینەوەی رۆژهەلات ) ١٩١٥ ، بلاوکراوەی دووەم ، لاپەرە ، ٤٣٣ ، ٤٨٠ .

٥ - کورد - تێبینی‌و وردبوونەوە ، پیترۆگراد ، ١٩١٥ ، ئەم کتێبەیە .

٦ ـ گەشتی نووێلەرانی رووس‌و ئینگلیز بەڕێزان مینۆرسکی‌و سیبلی لە ٨/حوزەیران ـ ١٦/ئەیلولی/١٩١١ ، بـۆ ناوچــەکانی فارس کە تـورکیا داگیری کردبوو.
( کەرەستە بـۆ لێکۆڵینەوەی رۆژهـەڵات ، ١٩١٥ ، بڵاوکراوەی دووەم ، لاپــەڕە ، ١ ـ ١٣٢ ، لەگەڵ نەخشــەدا .

٧ ـ سنووری تورك‌و فارس ، کە نێرراوی ئیمپراتۆریەتی رووسی مینۆرسکی لە ساڵی ١٩١٤دا دیاریی کردووە .
( کەرەستە بـۆ لێکۆڵینەوەی رۆژهەڵات ) ١٩١٥ ، بڵاوکراوەی دووەم ، لاپەڕە ، ٢١٩ ـ ٤٣٢ ، لەگەڵ ٦ نەخشەو ١٢ وێنەدا .

٨ ـ دیاری کردنی سنووری تورك‌و فارس ( دەنگوباسی کۆمەڵەی جوگرافی ئیمپراتۆریەتی رووسی ، ١٩١٦ ، بەرگی . ٥٥ ، بڵاوکراوەی پێنجەم ، لاپەڕە ، ٣٥١ ـ ٣٩٢ لەگەڵ ٩ نەخشەو ٣ خشتەی تـرو یەك وێنەدا .

٩ ـ کۆنی‌یەتی ماکۆ ، تێبینی ، گەڕۆکێك ، پێترۆگراد ، ١٩١٦ ، لاپەڕە ، ٢٩ ، لەگەڵ ، ٨ ، نەخشەدا .

١٠ ـ کێلە شین‌و کۆنترین پاشماوەی مێژوویی لــە نزیکی دەریاچەی وانەوە ( بڵاوکراوەی بەشی رۆژهـەڵاتی کۆمەڵەی پاشماوەکانی ئیمپراتۆریەتی رووسی ١٩١٦ ، بەرگی ، ٢٤ ، لاپەڕە ، ١٤٥ ـ ١٩٢ ـ بەزمانی ئینگلیزی .

١١ ـ مەسەلەی موســڵ ( مەڵبەندی پرسگای مەسـەلەکانی جیهانی ـ سەر بە نامەخانەی ئەمریکی لــە پاریس ،

١٥/نیسانی/١٩٢٦ ، ژماره ، ٩ـ ١٠ ، لاپەڕە ، ١ ـ ٤٤ لەگەڵ دوو نەخشەدا .

١٢- تێبینی دەربارەی ئەلف‌و بێ ی کوردی لاتینی (گۆڤاری کۆمەلەی شاهانەی ئاسیایی ، تەمووزی ، ١٩٣٣ ، بەشی سێیەم ، لاپەڕە ، ٦٤٣ ـ ٦٥٠ .

١٣- راپۆرتێك دەربارەی کتێبی (آ . م . هاملتۆن) گەشتێك لە کوردستاندا ، لەنــدەن ، ١٩٣٧ ، چاپی یەکەم ، (بلاوکراوەی قوتابخانەی رۆژهەلات‌و لێکۆلینەوەکانی ئەفریقی ، ١٩٣٧ ، بەرگی نۆهەم ، ژمارەی یەکەم) .

١٤- راپۆرتێك دەربارەی کتێبی ( ئی ، ر ، لیچ بـاســا کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌یەکانی رەوانـدزی کورد ) لەندەن ، ١٩٤٠ ، گۆڤاری جــوگرافی ژمارەی نیسانی ١٩٤١ .

١٥- گۆران ( بـلاوکراوەی قوتابخانـەی رۆژهــەلاتی و لێکۆلینەوەکانی ئەفریقی ) ١٩٤٣ ، بەرگی یانزەهەم ، بەشی یەکەم ، لاپەڕە ، ٧٥ـ١٠٣ ، دکتۆر ناجی عباس ئەم وتارەی کردووە بە کوردی ، ســەیری گۆڤای گەلاوێژی ژمارە ، ٥ ـ ٩ ، بەغداد ١٩٤٢ ، بکە .

١٦- هۆزەکانی رۆژئاوای ئێران ، ( گۆڤاری ئامۆژگای ئەنترۆبۆلۆجی شاهـانـە ) ١٩٤٥ ، بەرگی ٧٧ ، بەشی یەکەم‌و دووەم ، لاپەڕە ـ ٧٣ ـ ٨٠ .

١٧- راپۆرتێك دەربارەی کتێبی (آ. سافراستیان ، کوردەکان‌و کوردستان ، لەندەن ، ١٩٤٨ ، نامەخانەی رۆژهەلاتی ، لایدن ، ١٩٥٠ ، ژمارەی دووەم لاپەڕە ، ٥٠ـ٥١ .

١٨ـ لێکۆڵینەوەی مێژووی قەفقاس ، لەنـــدەن ، ١٩٥٣ ، لاپەڕە ، ٩ ، ٢١ ، ٣٢ ، ٣٧ ، ١١٣ ، ١١٦ ، ١٢٤ ، ١٤٦ .

١٩ـ ناوی شوێنەکان لـــە کوردستانی موکریان بە زمانی مەغــۆلی ( بڵاوکراوەی قوتابخانـــەی رۆژهەڵاتیو لێکۆلینەوەی ئەفریقی ) ١٩٥٧ ، بەرگی نۆزدەهەم ژمارەی یەکەم .

بەزمانی فەرەنســی :ـ

٢٠ـ تێبینی دەربارەی ئەهلی حــەق ( گۆڤاری جیهــانی ئیسلامی ) ١٩٢٠ ، بەرگی ٢٥ ، ٢٦ ، لاپەڕە ، ١٩ـ٩٧ .

٢١ـ تێبینی دەربارەی ئەهلی حەق ( گۆڤاری مێژوو ئایین ) ١٩٢٨ ، بەرگی ، ٤٥ ، ژمارەی یەکەم ، لاپــەڕە ، ٩٠ ـ ١٥٠ .

٢٢ـ کلێبێکی کوردی ( گۆڤاری لێکۆڵینەوەی ئیسلامی ) ١٩٣٠ ، بەرگی چوارەم ، بەشی یەکەم ، لاپەڕە ، ١٥٧ ـ ١٦٠ .

٢٣ـ فەرمانڕەوایی دیلەمێیەکان ، ( بڵاوکراوەی کۆمەڵەی لێکۆڵینەوەی ئێرانیو فارسی ) پاریس ، ١٩٣٣ ، ژمارەی سێیەم ، لاپەڕە ، ٢٦ .

٢٤ـ دەربارەی پەیوەندییەکانی تورکیاو ئیتالیا لەسەدەی پانزەهەمــدا ( بڵاوکراوەی کۆمەڵەی لێکۆڵینەوەی ئێرانیو فارسی ) پاریس ١٩٣٣ ، ژمارەی هەشتەم ، لاپەڕە ، ٢٣ .

٢٥ـ نەژادی کورد لە کلێبێکدا ( راپۆرتەکانی کۆنگرەی

بیستەمی رۆژهەڵات ناسی جیهانی لەساڵی ١٩٣٨ ) دا
برۆکسل ، ١٩٤٠ ، لاپەڕە ، ١٤٣ ـ ١٥٢ .
٢٦ـ تێکستی کوردی کۆن ( بڵاوکراوەی مەڵبەنـدی کورد ناسی ، پاریس ، ١٩٥٠ ، ژمارەی دەهەم ، لاپەڕە ٨ ـ ١٠ .

چەند وتارێك لە ( دائیرەی زانیاری ئیسلامی ) دا : ـ

٢٧ـ کورد ، کوردستان بەرگی دووەم ، چاپی فەرەنسی ، لاپەڕە ، ١١٩٦ ـ ١٢٢٢ چاپی ئینگلیزی لاپەڕە ، ١١٣٠ ـ ١١٥٥ ، چاپی ئەڵمانی ، لاپەڕە ، ١٢١٢ ، ١٢٤٠ .
٢٨ـ لەك ، بەرگی سێیەم ، چاپی فەرەنسی ، لاپەڕە ، ١١ ـ ١٢ ، چاپی ئینگلیزی لاپەڕە ١٠ ـ ١١ چاپی ئەڵمانی لاپەڕە ، ١١ ـ ١٢ .
٢٩ـ لوڕ ، لوڕی گەورەو لوڕی بچوك ، چاپی فەرەنسی لاپەڕە ، ٤٣ ـ ٥١ چاپی ئینگلیزی لاپەڕە ، ٤١ ـ ٥٠ ، چاپی ئەڵمانی لاپەڕە ، ٤٥ ـ ٥٤ .

# بەرهەمە چاپکراوەکانی پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار

١ ـ أغاني كوردستان ، بەغداد ، ١٩٥٦ ، بەزمانی عەرەبی .

٢ ـ کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا ، بەغداد ، ١٩٦٢ ، بە زمانی کوردی .

٣ ـ لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردی تازەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ، بەزمانی رووسی .

٤ ـ الاكراد ـ ملاحظات وانطباعات ـ مینۆرسکی بەرووسی نووسیوویەتی و د . مارف کردویەتی بە عەرەبی و لەسەری نووسیوەو پێشەکیشی بۆ نووسیوە ، بەغداد ، ١٩٦٨ ، بەزمانی عەرەبی ، ئەم کتێبەیە .

٥ ـ دووانزە سوارەی مەریوان و ١٥ چیرۆکی تر ، گۆڕین و رێکخستن و ئامادەکردنی بۆ چاپ و نووسینی پێشەکی ، مۆسکۆ ، ١٦٩٨ ، بە زمانی رووسی .

٦ ـ بووکە شووشـــە ، چیرۆکێکی کوردییە ، بەغداد ، ١٩٦٩ ، بەزمانی کوردی .

٧ ـ ئەڵمان کوردی و چەند چیرۆکێکی تـری کوردی ، بەغداد ، ١٩٦٩ ، بەزمانی کوردی .

٨ ـ عەبدوڵلا بەگی میسباح الدیوان ، شاعیری گەورەی

خاکی موکریان ، بەغداد ۱۹۷۰ ، ( بەزمانی کوردی، نوێشکی بەعەرەبیو ئینگلیزی ) .

۹ ـ زمانو ئەدەبی کوردی ، بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی ، بەغداد ، ۱۹۷۱ ، لەگەڵ دوو نووسەری تردا ، بە زمانی کوردی .

۱۰ـ دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی ، دانانی عەلی تەرەماخی ، سەدەی حەڤدەهەمی زایلی ، بەغداد ، ۱۹۷۱ ، ( بەزمانی کوردی نوێشکی بە ئینگلیزی ) .

۱۱ـ شیعری سیاسی کوردی لە کوردستانی عێراقدا ، بەغداد ، ۱۹۷۲ ، بە ( زمانی کوردی ) .

۱۲ـ تێکستی (مەمو زین) یا (مەمی ئالان) ی فۆلکلۆری لە کۆکراوەکانی (مارتن هارتمان) بەغداد ، ۱۹۷۳ ، بە زمانی کوردی .

۱۳ـ فەرهەنگۆکی کوردی ـ زووحەیاتەین ، بەغداد ، ۱۹۷٤ ، بە زمانی کوردی ·

۱٤ـ گوڵ لە شیعری شاعیری کورد حەمدیدا ، ۱۸۷۸ ، ۱۹۳٦ ، بەغداد ۱۹۷٤ ، بە زمانی کوردی .

۱۵ـ شیعری بەرزی هەندێ لە شاعیرە ،کەم ناسراوەکانی کورد ، بەغداد ، ۱۹۷٦ بە زمانی کوردی .

۱٦ـ الروایه الشعریه ، (لەیلێو مەجنون) في الادب الکردی ، بەغداد ، ۱۹۷٦ ، بە زمانی عەرەبی .

۱۷ـ التخمیس والمخمس في الشعر الکلاسیکی الکردی ، بەغداد ، ۱۹۷۷ بە زمانی عەرەبی .

١٨- بۆ مەبەستی چاپێکی زانستی دیوانی سالم، ١٨٠٥ - ١٨٦٩، سلێمانی، ١٩٧٧، بە زمانی کوردی .
١٩- دڵدار، شاعیری ماوەی تاقی کردنەوەو گواستنەوە، بەغداد، ١٩٧٧، بە زمانی کوردی .
٢٠- مولەممەع لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، سلێمانی، ١٩٧٧، بەزمانی کوردی .
٢١- دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، بەغداد، ١٩٧٧، بە زمانی کوردی .
٢٢- مخطوطات فریدە ومطبوعات نادرة، بەغداد، ١٩٧٨، بە زمانی عەرەبی .
٢٣- وشەو تەعبیری تازە لە شیعری بێخود، بەغداد، ١٩٧٨، بە زمانی کوردی .
٢٤- نالی چۆن گوڵ دەبینێ، بەغداد، ١٩٧٩، بەزمانی کوردی.
٢٥- تأريخ الاستشراق والدراســات العربية والكردية فى المتحف الاسيوى ومعهد الدراسات الشرقية في لينينغراد، بەغداد، ١٩٨٠، لە رووسی یەوە کردوویەتی بەعەرەبی.
٢٦- شیعری ئاینی لە شێوەی گۆرانی ی زمانی کوردیدا، بەغداد، ١٩٨١ . بە زمانی کوردی، ئەم باسە بە زمانی عەرەبیش لە ساڵی ١٩٧٧دا بڵاوکراوەتەوە .
٢٧- شیعری شێوەی لوڕی، زمانی کوردی، بەغـــداد، ١٩٨١، بە زمانی کوردی .
٢٨- رەنگدانەوەی رووداوەکانی قەڵای (دمدم) لە ئەدەبی کوردیدا، بەغداد، ١٩٨١ بە زمانی کوردی .

٢٩- رحالة الرووس في الشرق الاوسط ، بغداد ، ١٩٨١ ، له رووسی‌یه‌وه کردوویه‌تی به عه‌ره‌بی .

٣٠- له ده‌فته‌ری نه‌مری‌دا له‌گه‌ڵ نالی ، به‌غداد ، ١٩٨١ ، به زمانی کوردی .

٣١- نامه‌خانه‌ی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٨١ .

❁ ❁ ❁

# بەرهەمە چاپکراوەکانی وەرگێڕی کوردی

١ ـ یادی ٨١ ساڵەی رۆژنامەنووسیی کوردی ، ١٩٧٩ ، سلێمانی .

٢ ـ ژیانی کوردەواری لە عەرەبی یەوە کردوویەتی بە کوردی ، ١٩٨٠ ، سلێمانی .

٣ ـ نیشتمانی جوان ، کۆمەڵە چیرۆکێکە بۆ منالاّن ، لە عەرەبی یەوە کردوویەتی بە کوردی بەغداد . ١٩٨١ .

٤ ـ یادداشتەکانی رۆژنامەنووسیم ، مەکسیم گۆرگی ـ لە عەرەبی یەوە کردوویەتی بە کوردی ـ ١٩٨٣ ـ سلێمانی .

٥ ـ کورد ـ ئەم کتێبەیە .

٦ ـ دیداری شیعری کلاسیکی کوردی ـ لە ژێر چاپدایە ـ .

# وێنەی بەرگی کتێبەکە بە رووسی

В. Ф. Минорскій.

# КУРДЫ.

## ЗАМѢТКИ и ВПЕЧАТЛѢНІЯ.

Персидскіе курды шеккаки.

ПЕТРОГРАДЪ.

Типографія В. Ѳ. Киршбаума, Дворц. пл., д. М-ва Финансовъ.

1915.

١ـ لەكانگای دڵمەوە سوپاسی هاوڕێی خۆشەویستم كاك (حمەی حمە باقی) ئەكەم كەهانی دام بۆ ئەوەی ئەم كتێبە بكەم بـە كوردی وەپڕ بەدڵ سوپاسی پڕۆفیسـۆر (مارف خەزنەدار) ئەكەم كەبەم وەرگێڕانەدا چووەوەو پێشەكی بۆ نووسـیو تێبینی باشـی دامێو نموونەیان هـەر زۆربێ بۆ خـزمەت كردنی ئەدەبی كوردی ٠

٢ـ بەڕێز (د٠خەسرەو غەنی شاڵی) سەرۆكی زانكۆی سەلاحەددین لەچاپكردنی ئەم كتێبەدا یارمەتی زۆری دام ، بۆیە پڕ بەدڵ سوپاسی ئەكەم ، لەگەڵیا زۆر سوپاسی كاك (شـێخ حسـێن حسن) بەڕێوەبەری چاپخانەو كاربەدەسـتانو كرێكارانـی چاپخانەكەیـان ئەكەم ئەوانیشـ لەچاپدا بەشـی خۆیـان یارمەتییان دام ٠

٣ـ چاكەو پیاوەتی كـاك (ئەوڕەحیمە دزە)ی هەڵەبجەم لەیـاد ناچێ كە ئەركی چاپكردنی كتێبەكەی گرتە ئەستۆی خۆی ٠ هەروەها كاك (خالید زامدار)ی هونەرمەند نیگاری بەرگی كتێبەكەو نووسینی ناونیشانەكانی گرتە ئەسـتۆی خۆی ، ماڵی ئاواو تەمەن درێژ بێ بۆ خزمەتی هونەری كوردی ٠

**حمە سـعید**

# ناوەرۆك

